

# دووباره دۆزینەوەی پایەی دووەمی ئیسلام

## پوختەی کتێبی (إدارة الصلاة)


ئەحمەد بەسام ساعی

و: حسێن محەمەد ئیبراهیم



لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٥٧)


دووباره دۆزینەوەی پایەی دووەمی ئیسلام

ئەحمەد بەسام ساعی

**ئەم کتێبە:**

زۆر پێویستە جارێکی تر خۆمان و پەرستشەکانمان و چواردەورمان بدۆزینەوە، جارێکی تر خوێندنەوەیان بۆ بکەینەوە، کچ و کورەکانمان لەسەر پەیرەوێکی هزریی بنیات بنێین کە یارمەتییان بدات لەسەر دۆزینەوەی چواردەوریان.

لە ژیانی گشتی ئێمەدا، لە دامەزراوە پەروەردەییەکانماندا کۆمەڵێک بابەت و بەشی جیاجیای پەیوەست بە زانستی کارگێڕی و بەڕێوەبردن هەن و بڵاون کە گرنگی دەدەن بە لێکۆڵینەوە لە باشترین ڕێگا بۆ وەبەرهێنان لە پڕۆژە پیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵی و ئاوەدانکردنەوەییەکاندا، بەڵکو گرنگی دەدەن بە سوودوەرگرتن لە هەموو شتێک کە قازانج و سوود بۆ مرۆڤ دەستەبەر بکات، ئایا ئێمە هیچ کات بیرمان لەوە کردۆتەوە کە هەوڵ بدەین بابەتێک یان بەشێک یان تایبەتمەندیەک دابمەزرێنین لە قوتابخانە و زانکۆ و پەیمانگاکانماندا کە ببێتە هۆی سوودگەیاندن و وەبەرهێنانێکی وا کە لە هەموو ئەو پڕۆژانە باشتربن کە باسمانکردن، بۆ دنیا و قیامەت خێردارتر و بەهرەدارتربن؟ بەشێوەیەک کە هۆکارێکی سەرەکیبن لە سەرکەوتنمان لە هەموو پڕۆژە دنیاییەکانیشماندا؟ ئەویش بەڕێوەبردنی پەرستشەکانمانە بەشێوەیەکی باش، دۆزینەوە و کاراکردنەوەیانە جارێکی تر، لەسەروو هەمووشیانەوە نوێژکردن؟ کە بەڕاستی وادەیە لەگەڵ خوادا، بەڵام چ وادەیەک! بەڕاستی نوێژ، پەرستشێکە لە چڵەپۆپەی پەرستشەکانە، یان بڵێین لە چڵەپۆپەی وەبەرهێنانە دنیاییە–دوارۆژیەکانمانە.

ئەم کتێبەش هەوڵێکە بۆ یارمەتیدان لە بەڕێوەبردنی ئەو وەبەرهێنانە گەورەیە.




نرخی (٤٠٠٠) دینار

## سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.
- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.
- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.
- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.
- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.



## ئەحمەد بەسام ساعی

- لەدایکبووی ١٩٤١ لە سوریا، لازقیە.
- دکتۆرا لە ئەدەبی عەرەبی لە زانکۆی قاهیرە.
- مامۆستا بووە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد.
- دامەزرێنەری ئەکادیمیای ئۆکسفۆردە بۆ خوێندنی باڵا.
- ئەندامە لەچەندین دامەزراوە و سەنتەری زانستی.
- خاوەنی چەندین دانراوە لە بوارەکانی ئەدەب و ڕەخنە و شیعر و ڕۆشنبیری ئیسلامیی.
- لە ناوازەترین کتێبەکانی (المعجزة؛ إعادة قراءة الإعجاز اللغوي في القرآن الكريم).



## حسێن محەمەد ئیبراهیم

- لەدایکبووی ١٩٧٧.
- دکتۆرا لە بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی.
- خاوەنی پتر لە دە توێژینەوەی زانستیی.
- ئەندامی بۆردی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی.
- پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە زانکۆی سلێمانی.



# دووبارە دۆزینەوەی پایەی دووەمی ئیسلام

## پوختەی کتێبی ( إدارة الصلاة )

**دووبـاره دۆزینەوەی پایەی دووەمی ئیسلام**

**پوختەی کتێبی ( إدارة الصلاة )**

............................................................................................

له بڵاوكراوەكانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی
ژمارە (٥٧)

- نووسینی: ئەحمەد بەسام ساعی.
- وەرگێڕانی: حسێن محەمەد ئیبراهیم.
- بابەت: ئاینیی.
- دیزاین: رەوشت محەمەد.
- چاپ: یەكەم ٢٠١٧.

له بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان
ژمارە (٩٢٨)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە.

# ناوەڕۆك

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

# نزایەك[1]

خوایە گیان تۆ دەزانی من مەبەستم لەم لاپەڕە نوسینانە و بەدڵداهاتنانەم هیچ شتێك نەبووە تەنها تۆ و ڕۆژی دوایی نەبێت، کاتێك کە رووم کردۆتە تۆ بە زمانە مرۆڤانەییە لاوازە سنووردارەکەی خۆم، چونکە هەر ئەو وشە سادە و کەمانە شك دەبەم کە وتووێژی پێدەکەم لەگەڵ مرۆڤە ئاساییەکان، کە هەرگیز ناگەنە ئاستی وتووێژکردن لەگەڵ زاتی بەرز و بەڕێزی تۆ، ناتوانن بەتەواویی لە گەورەیی و بەرزیی تۆ تێبگەن و باسی بکەن. ئەگەر ئەم وشانەم بەهەڵەیان بردم لەم کتێبەدا، ئەوا لە ڕێی گەیشتن بە تۆ تووشی هەڵە بووم، ئەگەر لە پێکاندا بەهەڵەدا چووم، یان زمانم لە ڕێگا لایدا، ئەوە تۆ بۆخۆت دەزانی لە سەرەتا و کۆتاییشدا کە من هیچ ئامانجێکم نەبوو تەنها گەیشتن نەبێت بە حەقیقەتی ئەوەی تۆ دەتەوێت، بەڵام ئێمەی مرۆڤ لەکوێ دەتوانین میچی ئامانجی کارە جوانەکانت دەرك پێبکەین، لە نهێنیەکانی ئەو نیگا و سروشانە تێبگەین کە لەگەڵ پێغەمبەری خۆتدا (دروودی خودای لەسەر بێت) کردوتن لە میعراجە مەزنەکەیدا کاتێك کە فەرمانە پیرۆزەکانی تۆی وەردەگرت بە واجبکردنی پێنج نوێژە فەرزەکان، ئەویش لەگەڵ خۆیدا بۆمانی

[1] ئەم نزایە لە کورتکراوەی نوسخە عەرەبیەکەدا نەهاتووە، بەڵکو لەنوسخە تەواوەکەدایە، وەرگێر بەپێویست و شیاوی زانی لەدەقە کوردییەکەدا هەبێت.

هێنایەوە بۆ سەر زەوی بەو هەموو گەوهەرە تاقانانەوە و بەو هەموو وردەکاری و نهێنیانەوە.

خوایە گیان ئەوەی کە پێکام لەم کتێبەدا ئەوە پاداشتم بدەرەوە بە چاکترین ئەو پاداشتانەی کە دەیبەخشیت بە پیاوە صاڵحەکانی خۆت، ئەوەی کە هەڵەشم کرد تیایدا لە بیرکردنەوە و پێوانە و راڤەکردن و گوزارشتەکانم کە بەشێوەیەك زمانە لاوازەکەم پەلەی پێکردم لە هەڵە لە دەربڕینی راستگۆییم بۆ بەگەورەزانین و بەرزیی تۆ، قەڵەمەکەم ناشوێنبەجێیی نووسی و نەیتوانی بمگەیەنێتە ئاسمانی کاربەجێیی تۆ، ئەوە تۆ پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەوەش، چونکە بۆخۆت دەزانی کە من تەنها ویستومە سوود لە رووناکی رێنموویی رێگە راستەکەی تۆ وەربگرم، بەشی خۆم بپچرم لە سەرچاوەی کانیاوەکانی بەزەیی تۆ کە هەتە بەرامبەر بە بوونەوەرەکان، تۆ هەموو کات لێبوردە و لێخۆشبوویت و بەندەکانت زۆر خۆش دەوێت و بەخشندەی لەگەڵیان و لە هەموو بەڕەحمەکان بەڕەحمتری.

**ئەو کەسەی هەمووکات خۆی دەپارێزێت بەڕەحمەتی تۆ**

**دانیشتووی ئۆکسفۆرد**

**ئەحمەد بەسام ساعی**

# وادەیەك لەگەڵ خودا

پێی وتم بەسەرسوڕمانیەوە: بەڕێوەبردنی نوێژ– إدارة الصلاة؟! وتم: ئەگەر مرۆڤەكان ئیدارە و بەڕێوەبردنی كاروبارەكانی دنیایان بخوێنن بۆ ئەوەی بەباشترین شێوە وەبەرهێنان بكەن تیایدا و بۆ چنینەوەی ئەوەی لە توانایاندایە لە قازانج، بۆچی نا كە ئەم كردەوەیە قازانجی نەبڕاوەیە و ئەو خەڵاتەیە كە كەم ناكات؟ ئایا هیچ كردەوەیەكی شایستەتر هەیە كە وەبەرهێنانی تێدا بكرێت و باشتر بەڕێوەببرێت و پاشەكەوتی تێدا بكرێت لە كارێكی ناوازەی وەك نوێژ كە مەبەست لێی چنینەوەی خێرەكانی دنیا و پاشەڕۆژە بەیەكەوە؟

جارێكیان وا ڕێكەوت لە ڕۆژێكی ڕەمەزانیدا یانەی خوێنكارە سعودیەكانی شاری ئۆكسفۆرد بانگهێشتیان كردم بۆ پێشكەشكردنی وانەیەك پێش ڕۆژوو شكاندن، منیش بڕیارمدا باسەكەم بۆیان قسەكردن لەبارەی (بەڕێوەبردنی نوێژ – إدارة الصلاة)ەوە بێت. لەكاتی دیاریكراودا چوومە شوێنی پێشكەشكردنی وانەكە و پەڕەیەكم بەدەستەوە بوو، كە دوو ئایەت و دوو فەرموودەم تیایدا تۆمار كردبوو سەبارەت بە نوێژ، سەلامێكی ئاساییم لێكردن و پەڕەكەم كردەوە و بەخێراییەكی زۆرەوە ئەو شتانەی تیایدا نوسیبووم بۆم خوێندنەوە، بەشێوەیەك كە زۆربەی ئەوەی خوێندمەوە تێی نەگەیشتن، لە یەك خولەكدا لە خوێندنەوەی ناوەڕۆكی پەڕەكە بوومەوە و خێرا پێچامەوە و دەستمكرد بە ڕۆیشتن و وتم: داوای لێبوردن لە خێراییەكەم دەكەم، بەڵام ناچارم هەر ئێستا كە بەجێتان بهێڵم، چونكە من وادەیەكی ترم هەیە لەگەڵ خەڵكانێك كە زۆر لە ئێوە گرنگترن لەلام.. خوداتان لەگەڵ، پاشان جامتاكەم هەڵگرت و بەرەو دەرگا هەنگاوم نا، بە تیلەی چاوم هەستم بە سەرسوڕمانێك دەكرد كە زمانیانی بەستبوو، لە دەموچاویاندا تێكەڵەیەك لە گلەیی و سەرسوڕمان و باوەڕنەكردنم دەخوێندەوە، بەڵكو ناڕەزایی و بەكەم زانینیانم هەست پێكرد.

ئەوە هەڵوێست و پەرچەکرداری راستەوخۆی مرۆڤە لە بەرامبەر هەڵسوکەوتێکی نەشیاو و بێ ئەدەبانە لە رووی ئەوانەی چاوەڕێی چاوپێکەوتن لەگەڵیدا دەکەن، ئەی باشە تێڕوانینتان چۆنە سەبارەت بە هەڵوێست و وەڵامی خودایی کە ئەم کارە نەشیاوە دەرحەق بە ئەو بکرێت؟

پاش چەند چرکەیەك گەڕامەوە لای خوێندکارەکان بۆ ئەوەی پۆزش بێنمەوە بۆ ئەو هەڵوێستەم و وتم: ئایا ئێوە توڕەن لە من؟ باشە من یەکجار ئەم هەڵوێستەم نواند لەگەڵ ئێوە، وا ئێستا من هاتمەوە داوای لێبوردن دەکەم لێتان، بەڵام دەزانن ئێمە هەموو رۆژێك پێنج جار ئەم کارە لەگەڵ خوادا دەکەین و داوای لێبوردن ناکەین و پەشیمانیش نابینەوە.

چەند هەلێکی جوان و سەرنجڕاکێشە، چ وادەیەکی گەورەیە، چ بۆنەیەکی بەخشندەیە لەدەست خۆتی دەدەیت و بەچروکیی کاتەکانی خۆت بەرامبەر بەخودا دەبەخشیت، نوێژێکی بەم شێوەیە دەکەیت لەبەردەستیدا، ئەگەر بگونجێ پێی بڵێین نوێژ؟ ئایا ئەوەتان رەچاوکرد کە من ئایەت و فەرموودەکانم لەو پەڕەیە خوێندەوە بەسەر خوێندکارە سعودیەکان کە پێم بوو، نەك لەبەرم بێ؟ کامیان کاریگەرترە لەسەر بیسەران: لە پەڕە بیخوینیتەوە، یان لەبەرت بێ؟ ئێمە زۆر جار ئایەتەکانی ناو نوێژ وادەخوێنین وەك ئەوەی لەبەر پەرە بیخوێنین، ئەوە خوێندنەوەیە کە لە زمانمان دەردەچێت نەك لە دڵمان، چەند جیاوازە نوێژەکان بە زمان بخوێنین لەگەڵ ئەوەی کە بەدڵ بیخوێنین.

چ پڕۆژەیەکی وەبەرهێنانی گەورەیە خودای گەورە لەسەر خوانێکی زێڕین پێشکەشی کردووین؟ ئێمەش توڕی دەدەین و بەگرنگی نازانین تا مایەپووچ دەردەچین لێی و هیچ شتێکمان دەست ناکەوێت؟ ئەگەر ئێمە لۆژیکیانە بین لەگەڵ خۆمان و بڕوانینە ئەم جۆرە سڵاو و نوێژکردنانە لە رەتکردنەوە و بەکەم زانین و پشتهەڵکردن نەبێت هیچی تر ناگەیەنن، بەڵکو لە گاڵتەکردنەوە نزیکترە نەك سڵاو و

نوێژکردن، جا لەگەڵ کێش؟! لەگەڵ ئەو خودا مەزنە.

زۆر پێویستە جارێکی تر خۆمان و پەرستشەکانمان و چواردەورمان بدۆزینەوە، جارێکی تر خوێندنەوەیان بۆ بکەینەوە، کچ و کوڕەکانمان لەسەر پەیڕەوێکی فیکریی بنیات بنێیین کە یارمەتییان بدات لەسەر دۆزینەوەی چواردەوریان، تەنانەت لە داهێنانەکانی چواردەوریشیان، ئەگەر بمانەوێت سنووری ریزەکانی چاولێکەران و سەرکێڵەکان بەجێبێڵن و بڕۆنە ناو ریزی بیرمەندان و نوێگەران.

بیرمدێت لە کۆتایی چلەکانی سەدەی پێشوو کاتێك من لە تەمەنی حەوت یا هەشت ساڵاندا بووم کاتێك دایکم (رەحمەتی خودای لەسەر) لە سەردانی یەکێك لە خێزانە هاوڕێ گاورەکانی گەڕایەوە کە لە شاری لازیقییە دەژیان، هاتبووەوە، باسی "رادیۆیەکی سەیر"ی بۆ دەکردین کە کوڕەکەیان لە فەرەنساوە هێنابوویەوە، لە دوای ئەوەی کە خوێندنی لەوێ تەواو کردبوو، دایکم هەندێ وشەی فەرموو قەت لە بیرم ناچنەوە، دەیوت: ئەم رادیۆیە دەرگایەکی هەیە لەڕووی پێشەوەی دەتوانی ئەو مرۆڤە ببینیت کە قسەت بۆ دەکات!..

نەمتوانی ئەو شەوە بخەوم، چونکە بیرم لەو بێژەرە داماوە دەکردەوە کە خزاندویانەتە ناو ئەو سندوقی رادیۆیە بچوکەوە و دەرگایان لەسەر داخستووە: باشە چۆن توانیویانە بیخەنە ناوی؟ رەنگە گەڕابن یەکێکی لاشە بچوکیان هەڵبژاردبێت بۆ ئەم کارە بۆ ئەوەی لە سندوقەکەدا جێگەی ببێتەوە؟ باشە، بەڵام ئەو داماوە چۆن دەتوانێت ئەوە بکات؟ .. ئەوە بکات؟.. هتد داوای لێبوردن دەکەم، من بەم شێوەیە بووم کاتێك کە منداڵێکی بچوك بووم و بەم شێوەیە بیرم دەکردەوە، باشە ئەم بێژەرە داماوە چۆن دەتوانێت بڕوات بۆ دەست بەئاو گەیاندن؟ لە کوێ ئەم کارە دەکات؟ دەیان بەڵکو دەتوانم بڵێم سەدان پرسیاری لەو جۆرە کە بۆم دروست بووبوو نەیهێشت ئەو شەوە بخەوم، پاشانیش تا ماوەیەکی زۆر لە مێشکمدا دەهات و دەچوو، هەر بیرم لێدەکردەوە، تا دوایی بۆم

دەرکەوت کە ئەمە "تەلەفیزیۆنە".

منداڵەکانی ئێمە ئەمڕۆ کە لەدایك دەبن، رادیۆ و تەلەفیزیۆن و تەلەفون و مۆبایل و کۆمپیوتەر و سیدی و مانگی دەستکرد و تەیارە و سەیارە و جۆرەها ئامێری کارەبایی سەیر لە ماڵەوە و دەرەوەیاندا لەبەردەمیاندایە، هەرگیز بیر لە گەورەیی ئەم داهێنان و دۆزراوانە ناکەنەوە، بیر لە گەورەیی ئەو کەسانە ناکەنەوە کە دایانهێناون و دۆزیویاننەتەوە، بیر لە گەورەیی ئەو ساتە وەختە ناکەنەوە کە ئەو ئامێرانەی تێدا دۆزراونەتەوە بۆ ئێمە، زۆر پێویستە رایانابهێنین لەسەر دوبارە دەرککردن بە گەورەیی دۆزینەوەی ئەم شتانە، گەورەیی ئەو کەسانەی دۆزیویاننەتەوە، بۆ ئەوەی ئەم کارە پێشڕەویان بکات بۆ جارێکی تر دۆزینەوەی گەورەیی بنیاتنەرەکەی خۆیان لە دروستکردنی خۆیان و چواردەوریاندا، بۆ ئەوەی پێشەنگیان بێت بۆ دۆزینەوەی دینەکەیان و پەرستشەکانیان و تەپوتۆزی راهاتن و عادەتکردن و دوبارەبوونەوە بتەکێنن لەو شتانە، بۆ ئەوەی هەموو کات تازەبن لە چاویاندا بە شێوەیەك کە وا هەست بکەن یەکەمجارە ئەنجامی دەدەن یان دەیناسن، بەم شێوەیە قورئان دەیەوێت پەروەردەمان بکات و رامان بهێنێت، ئەگەر ئێمە خۆمان بە ئەهلی قورئان بزانین، رامان دەهێنێت لەسەر دووبارە دۆزینەوە لە زۆرێك لە ئایەتەکان، وەك دەفەرموێ:

ـ ﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ (٣) ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ﴾ {الملك: ٣–٤}، واتە: (هەر ئەو قاتە ئاسمانەکانی بە حەوت چین دروستکردووە، لە نێو بەدیهێنراوەکانی ئەو خوای میهرەبانەدا هیچ ناڕێکی و ناتەواوییەك بەدی ناکەیت، ئەی ئینسان: هەر چاو بگێڕە و سەرنج بدە بزانە هیچ درز و کەموکوڕییەك بەدی دەکەیت؟! پاشان سەرنج بدە و چاو بگێڕە و وردبەرەوە جار لەدوای جار و کۆڵ مەدە سەرسام و ملکەچ دەبیت چاوت بە نائومێدی

دەگێڕێتەوە لەکاتێکدا کە چاوت ماندووە و پەکی کەوتووە).

ـ ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَنُ﴾ {الملك: ١٩}. واتە: (ئایا سەرنجی باڵندەتان نەداوە بەسەرتانەوە پۆل پۆل دەفڕن و باڵەکانیان لێکدەنێن، ئەو باڵندانە جگە لە خوای میهرەبان کەس بە ئاسمانەوە ڕاگیریان ناکات).

ـ ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَوْرًا فَمَنْ يَأْتِيكُمْ بِمَاءٍ مَعِينٍ﴾ {الملك: ٣٠}. واتە: (پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ باشە ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆچوو، کێ دەتوانێت ئاوی سازگار و ڕەوانتان بۆ بەدەست بهێنێت؟!).

ئەم پەیڕەوە قورئانییە زۆربەی سورەت و ئایەتەکان ڕێك دەخات، ئەو کۆمەڵگەیەی لەسەر ئەم پەیڕەوە دروست دەبێت هەموو کات خۆی بەشێوەیەك دەبینێ کە خۆی و چواردەورەکەی لە حاڵەتی خۆدۆزینەوەی بەردەوامدایە، کەواتە هەموو دەم لە حاڵەتێکی پێشکەوتوویی ژیاریی و ئیمانی بەردەوامدا دەبێت و نەوە لەدوای نەوە هەروا دەمێنێتەوە، لەڕاستیدا ئێمە بانگهێشت کراوین هەموو بەیانیەك چاویلکەیەکی تازەی بەکارنەهاتوو لەچاو بکەین، بۆ ئەوەی لە ڕێیەوە سەیری خۆمان و جیهانی چواردەورمانی پێبکەین، بەشێوەیەك وەك ئەوەی کە یەکەمجارە دەیبینین، دەزانن بەم شێوە نواڕینە بەم چاویلکە نوێیانە چەند نزیك دەبینەوە لە خودای مەزن؟.

لەڕاستیدا لە ژیانی گشتی ئێمەدا، لە دامەزراوە پەروەردەییەکانماندا کۆمەڵێك بابەت و بەشی جیاجیای پەیوەست بە زانستی کارگێڕی و بەڕێوەبردن هەن و بڵاون کە گرنگی دەدەن بە لێکۆڵینەوە لە باشترین ڕێگا بۆ وەبەرهێنان لە پڕۆژە پیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵی و ئاوەدانکردنەوەییەکاندا، بەڵکو گرنگی دەدەن بە سوودوەرگرتن لە هەموو شتێك کە قازانج و سوود بۆ مرۆڤ دەستەبەر بکات، سوودی تایبەتی بێت یان گشتی، ئایا ئێمە هیچ کات بیرمان لەوە کردۆتەوە

هەوڵ بدەین بابەتێك یان بەشێك یان تایبەتمەندیەك دابمەزرێنین لە قوتابخانە و زانکۆ و پەیمانگاکانماندا کە ببێتە هۆی سوودگەیاندن و وەبەرهێنانێکی وا کە لە هەموو ئەو پڕۆژانە باشتر بێت کە باسمانکردن و سوودبەخشتر و بەردەوامتر بێت و قازانج و بەروبومەکەی زامنتر بێت، بۆ دنیا و قیامەت خێردارتر و بەهرەدارتر بێت؟ بەشێوەیەك بێت کە هۆکارێکی سەرەکی بێت لە سەرکەوتنمان لە هەموو پڕۆژە دنیاییەکانیشماندا؟ ئەویش بەڕێوەبردنی پەرستشەکانمانە بەشێوەیەکی باش، دۆزینەوە و کاراکردنەوەیانە جارێکی تر، لەسەروو هەمووشیانەوە نوێژکردن؟ کە بەڕاستی وادەیە لەگەڵ خوادا، بەڵام چ وادەیەك! بەڕاستی نوێژ، پەرستشێکە لە چڵەپۆپەی پەرستشەکانە، یان بڵێین لە چڵەپۆپەی وەبەرهێنانە دنیاییە—دواڕۆژیەکانمانە، پێت سەیر نەبێت کە جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوادا، ئەو فەرزە پڕ لە بەخشین و قوربانی و ماندووبوونە ترسناکە لە پلەی یەکەمی پەرستشەکان و لە پلەی دووەمیشدا نەهاتووە لە شەریعەتی ئیسلامیدا، بەڵکو لە پلەی سێیەمدا هاتووە، لە پێشیەوە چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك هەیە، لەپێش هەردووکیانەوە نوێژکردنە لە کاتە دیارەکانی خۆیاندا:

ـ عن عَبدُ اللهِ بن مسعودٍ (رضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: سَألتُ رَسولَ اللهِ (صلّى اللهُ عَلَيهِ وَسلّم) أيُّ الأعْمالِ أحَبُّ إلى اللهِ؟ قال: ((الصَّلاةُ عَلى وَقتِها))، قُلتُ: ثم أي؟ قال ((ثمّ برّ الوالدين))، قلت: ثم أي؟ قال: ((ثم الجهاد في سبيل الله)). *{رواه مسلم}*.

واتە: (لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خودای لەسەر) گێڕدراوەتەوە دەفەرموێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر): چ کردەوەیەك لە هەموو کردەوەیەك باشترە؟ فەرمووی: "نوێژکردن لە کاتەکانی خۆیدا"، وتم ئەی دوا ئەو؟ فەرمووی: "چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك"، وتم ئەی دوا ئەو؟ فەرمووی: "تێکۆشان لەپێناوی خودادا).

بەڕاستی فەرمودەیەکی سەرسوڕهێنەرە، ئەگەرچی زۆربەمان واڕاهاتووین

بەخێرایی تێپەڕین بەسەریدا، نوێژکردن لە جیهاد و تێکۆشان گەورەتر و گرنگتر بێت لە ڕووی ئارامیی و فەزل و پاداشتەوە بەچەند قاتیش گەورەتر و خێردارتر، بەڕاستی ئەمە بابەتێکە پێویستە ئێمە هەڵوێستەی لەسەر بکەین، بەتایبەت کاتێك خوای گەورە ناوزەدی دەکات بەوەی کە (إنها لكبيرةٌ) واتە بەڕاستی نوێژکردن قورس و گەورەیە لە سەرشانتان، بەڵام (خاشعین – ملکەچان)ی جیاکردۆتەوە، واتە ئەوان بە قورس و گەورە نایبینن لە سەرشانی خۆیان، چونکە ئەوان بە ملکەچییان لە نوێژەکانیاندا تام و لەزەت و ئارامیی و ئیسراحەت دەنۆشن و هەستی پێدەکەن، ئەو دیوارە پۆڵایینەیان بۆ دروست دەبێت کە پشتی پێدەبەستن لە ژیانیاندا، بەڵکو لەگەڵ ئەو پەیوەستبوونە بە ملکەچی و ئارامیی و لەسەرخۆییە لە خوێندن و هەستان و دانیشتن و جوڵە و بیرکرنەوە و ئاویتەبوونە خەیاڵییەدا دەتوانین بڵێین نوێژ قوتابخانەیەکی ڕۆحییە بۆ خۆڕاهێنان لەسەر ئارامگرتن و تەرکیزکردنی دەروونی و بێدەنگی و ملکەچی و قەبوڵکردنی بەرامبەر بەشێوەیەکی جوان و جوان گوێگرتن لێی و ئارامی جەستە و پەلەنەکردن و هەڵوێستەکردن لەسەر بڕیاردان و میانڕەویی لە بیروبۆچوون و هەڵوێستەکاندا و نەڕۆیشتن بەرەو پەڕگیری (التطرف) لە ئەحکامەکاندا و ژیرانە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵك و ژیاندا، جێگەی سەرسوڕمان نییە کە خودای گەورە لە چەندین ئایەتدا نوێژی پەیوەست کردووە بە ئارامی (صبر)وە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ﴾ {البقرة: ٤٥} واتە: (ئێوە پشت ببەستن بە ئارامگرتن و نوێژکردن، بەڕاستی نوێژ ئەرکێکی گەورە و گرانە، مەگەر لەسەر ئەو کەسانەی کە بەخۆشەویستی و سۆزەوە خواپەرستی ئەنجام دەدەن).

ـ ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ {طه: ١٣٢}. واتە: (فەرمانبدە بە هەموو تاکەکانی خێزانەکەت تا نوێژەکەیان بەچاکیی ئەنجام بدەن، بەردەوام و کۆڵنەدەر و خۆڕاگر ببە لەسەری).

# بۆچی نوێژ قورسە لەسەر شان "وإنها لكبيرة"

## نوێژ بۆچی؟

بۆچی (وادە – موعد)ەکانمان هەڵدەوەشێنینەوە؟ بۆ واز لـە سـەرقاڵیەکانمان دەهێنین؟ واز لە بازرگانیکردنەکانمان دەهێنین، هەموو کارە دنیاییـە ڕۆژانـەکانمان پلەی گرنگیەکەی هەرچەند بێت هەڵیدەپەسێرین بۆ ئەوەی بچین بۆ نوێژ؟

بۆچی پێغەمبەری خـودا نوێـژکردنی کـردووە بـە جیاکـەرەوەی نێـوان ئیمـان و کـوفر؟ بۆچـی ئاگادارکردنـەوە و جـەخت کردنـەوە لەسـەر نوێـژ لـە کۆتـا فەرمایشتەکانی پێغەمبەر بوو لە سەرەمەرگدا و دەیفـەرموو (الله الله في الصـلاة، الله الله في الصلاة)؟

ئایا نوێژکردن لە بنەڕەتدا سزایە، یان پاداشت؟ لە چ ڕوویەکەوە قورسە؟ ئەگەر قورسی تێدایە، ئەی تام و چێژەکەی لە کوێدایە؟ ئەگەر تام و چێژی تێدایە، بۆ لەو کاتانەدان؟ بۆچی بەم شێوازی هەستان و جوڵان و ژمارەی ڕکاتانەن؟ بۆ بـەم دەق و خوێندنەوانەن؟ بۆچی نوێژ لە هەموو ئاینەکاندا هەیە؟ بۆچی گەورەترە لە جیهاد و تێکۆشان و فیداکاری بە ڕۆح و گیان لە مەیدانـەکانی شـەڕدا، بەشـێوەیەك لـەلای خودا و پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر) ئەو پێگە گەورەرە ترسناکەی هەیە؟!

پێویستە من دان بەوەدا بنێم کە من پەنجا ساڵ بەبەردەوامی نوێـژم کـرد پـێش ئـەوەی بـۆم دەرکـەوێت کـە مـن بـەهۆی نوێـژەوە خـاوەنی گـەورەترین پـڕۆژەی بازرگانیم کە خودای گەورە پەسمەندەی خۆی لە حیسابە بانکیەکـەی منـدا دانـاوە بـۆ ئـەوەی بتـوانم وەبـەرهێنانی پێبکـەم، پێویسـتە لەسـەرم کۆشـش بکـەم بـۆ هەڵبژاردنی باشـترین ڕێگـا بـۆ بـەڕێوەبردن و بەکارخسـتنی بەشـێوەیەك بتـوانم بـە زۆرترین و گەورەترین قازانج و بـەروبووم و مـەزنترین تـام و چـێژەوە دەربچـم، کـە مرۆڤەکان ئاواتی پێبخوازن لەسەر ئەم زەوییە.

ئەگەر بەختت بوبێت جارێك هەڵكەوتبێت ئامادەی شەڕێك بووبیت لە نێوان دوو کۆمەڵە مێروولە لەسەر پارچە شیرینیەك، هەر لایەکیان دەیەوێت بۆخۆی بیبات، ئەویان دەچێتە سەر پشتی ئەویتر و ئەوی تر چڕنوکە بچوکەکانی دەخاتە ناو پێیەکانی ئەوی ترەوە دەیەوێت بیپچڕینێت و نەهێڵێت بگاتە پارچە شیرینیەکە، یەکێکی تر دەیەوێت زاڵ بێت بەسەر ئەوی تردا.. هتد، لەو کاتەدا بێگومان بەپێکەنینەوە رادەوەستیت بەدیاریانەوە و حەز بە ئەنجامی ئەو شەڕە سەیرە دەکەیت لە نێوان ئەو دوو سوپا بچووکەدا، لەسەر چی؟ لەسەر پارچە شیرینیەکی بێ نرخ، کە هیچ ناکات..

ئەگەر نوێژێکی راست و تەواوت کرد، نوێژێك هەستت کرد لەگەڵیدا بەرزدەبیتەوە لە دنیادا و دەگەیت بە خودای مەزن، پاشان لەو بەرزیە بڵندەوە سەیری خوار خۆت دەکەیت، کە بە نوێژکردنەوە بەجێتهێشت.. ئەو کات هەموو خوار خۆت دەبینی چی تێدایە، چەندە گەورە بێت لەو بەرزیەوە بچووکە و کەم و بێنرخە و خەریکە بە چاوی ئاسایی نەبینرێت، ئەو کات بۆت دەردەکەوێت کە ئەو پارچە شیرینییەی کە مێروولەکان شەڕیان بوو لەسەری هیچ نییە تەنها ئەو دنیا بێنرخە نەبێت کە تۆ لە ئاسمانەوە ئاوا بەبچووکی دەتبینی، ئەو مێروولە گەمژە بچووکانەی کە شەڕیان بوو خۆیان دەفەوتاند لەپێناو ئەو پارچە شیرینییە، ئەوانە هاوشێوەی تۆ و کۆمەڵێك مرۆڤن کە دژایەتیان دەکەیت و دژایەتیت دەکەن و شەڕدەکەن بەیەکەوە و تۆ زاڵدەبیت بەسەریاندا و پارچە شیرینیەکە بەدەست دێنیت یان ئەوان زاڵدەبن و پارچە شیرینیەکە وەدەست دێنن..

# گەشت لە واجبەوە بەرەو حەقیقەت

بەڵێ سەرەتا نوێژکردن لە شەریعەتی ئێمەدا بە واجببوون دەستپێدەکات، وەك لە فەرمودەی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر) هاتووەوە: ((مُرُوا أولادَكُم بِالصّلاةِ إذا بَلَغوا سَبعًا واضرِبوهُم عَليها إذا بَلَغوا عَشرًا)) {رواه أحمد عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده}.

واتە: (هانی منداڵەکانتان بدەن لەسەر نوێژکردن ئەگەر بوون بە حەوتساڵ، لە کەمتەرخەمیکردن تیاییدا لێیان بدەن ئەگەر بوون بە دە ساڵان)، هەر لەبەرئەوەشە دەفەرموێ: ((بَينَ الرّجُلِ وبَينَ الكُفرِ تَركُ الصَّلاةِ)) {رواه مسلم عن جابر بن عبد الله}.

واتە: (لە نێوان مرۆڤ و کوفردا وازهێنانە لە نوێژ).

بەڵام ئەم واجبە لە قۆناغەکانی دوایی لە تەمەنی مرۆڤدا وەك خۆی نامێنێتەوە، کاتێك کە منداڵ گەورە دەبێت و لە گاڵتە و بەرگی منداڵی دەردەچێت و هەست بە سروشتی نوێژکردن دەکات، هەست بە گرنگی کردنەوەی ئەو دەروازە گەرم و گوڕە دەکات کە دەیکاتەوە لەگەڵ خودای خۆی، ئەو کات وردە وردە تێگەیشتنی بۆ چەمکی (واجب)ی نوێژ بەرەو دوواوە دێت، لە جێگەیدا وردە وردە چەمکی حەقیقەت جێگەی دەگرێتەوە.

ئایا بینیوتە چۆن ئێمە زۆر لە منداڵ دەکەین بۆ خواردنی دەرمانەکانی کاتێك نایەوێت بیخوات؟ بەڵام لەگەڵ رۆیشتنی کاتدا لەگەڵ گەورەبوونی منداڵ وردە وردە و بوونی بە پیاو، یان بە ژن، دەبینین دەستەواژەی "دەرمان" لە پێویستبوون و واجبەوە دەگۆڕدرێ لە لای بۆ قۆناغی واقیعی بوون و حەقیقەت، ئیتر وای لێدێت بەتەواوی هەست دەکات کە لەو دەرمانەدا ڕزگاربوونی رۆح و گێڕانەوەی لەشساغی هەیە.

بیر بکەرەوە، ئەگەر تۆ بتەوێت خانوویەکی گەورە بەکرێ بگریت کە زۆر دڵت پێوەیەتی، جوانیەکەی سەرسامی کردوویت و فراوانی و خۆشی شوێنەکەی و

عەجایبی ئەساس و کەلوپەلەکانی ناوی زۆر کاریگەری لەسەرت داناوە، کاتێك خۆت یەکلا دەکەیتەوە بۆ بەکرێگرتنی و بڕیار دەدەیت و لەگەڵ خاوەنەکەی دەست دەکەیت بە دانوستان و وتوێژ لەسەر نرخی بەکرێگرتنەکەی، ئەوەی کە چاوەڕواننەکراوە بۆ تۆ ئەوەیە خاوەنەکەی بڵێت: کرێکەی لە لای من ئەوەیە جەنابت پێنج ژەم لەسەر حیسابی من پێنج بەشەخۆراکی خۆش و بەتام بخۆیت، من هیچ شتێك زیاتر یان کەمترم لە تۆ ناوێت بۆ کرێی ئەم خانووە!

ئەمە چ دەرخستەیەکی بەخشندانەیە؟! پێتان وایە شتی وا رووبدات؟ بەڵێ ئەوە ئەو دەرخستە خودایییە کە بۆ ئێمەی داناوە بۆ ئەوەی لەسەر زەویەکەی ئەو جێنشین بین، لە خێروبێرەکەی بەهرەمەند ببین و لینگمانی لێ درێژ بکەین بەتێروتەسەلی بژین تیایدا و بەشداری بکەین لە ئاوەدانکردنەوەیدا.

ئایا ستەم ناکەین لە خۆمان کە بەشێك لە کاتەکانمان نەدەین بەو پێنج نوێژە رۆژانەیە، بەقەدەر ئەوەی دەیدەین بە ژەمە خۆراکەکانمان؟ ئایا ستەم ناکەین لەخۆمان کە چێژ وەرنەگرین لە ژەمە نوێژەکانمان وەك چۆن چێژ وەردەگرین لە ژەمە خواردنەکانمان؟ بۆچی کات بەپاراوی دەدەین بە ژەمە خواردنەکانی جەستەمان، بەڵام رەزیلی دەکەین لە پێدانی کاتی پێویست بۆ ژەمەکانی رۆحمان؟ باشە کامیان گرنگترە؟

باشە ئیوە بیستوتانە بەمەرج بگیرێت بۆ وەرگرتنی خەڵاتێك کە دەبێ خاوەنەکەی خەڵاتێکی گەورەتر وەربگرێت ئینجا ئەو خەڵاتەی پێدەدرێت؟ ئەمە چ جۆرە خەڵاتێکە؟! ئەوە نوێژە، تۆ پاداشتە گەورەکەی وەرناگری لە لای خودا تا پاداشتە رۆحیەکەی وەرنەگریت بەچێژوەرگرتنت لێی بەشێوەیەك کە دەروونت ئەم چێژە بە مافێکی خۆی دەزانێت، نەك بە ئەرك و واجب و قورسایی سەر شان.

چ جۆرە چێژێکە هەستی پێدەکەیت کاتێك نوێژەکەت دەستپێدەکەیت بە وتنەوەی وتەی: الله أکبر، کاتێك وا دێنیتە بەرچاوت کە فریشتە دێت و گوناهەکانت

هەڵدەگرێت، هەموو گوناهەکانت کە وەك دوو تاوەری بەرز لە ناو شانەکانتدا دایاندەنێت و کاتێك دەچیتە رکوع و سوژدە ئەم دوو تاوەرە گوناهە دادەرمێن قات بەقات، کەواتە رکوع و سوژدەکانت درێژ دەکەیتەوە یان کوورتی دەکەیتەوە؟

ـ پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) دەفەرموێ: ((إنَّ العَبدَ إذا قامَ للصَّلاةِ أُتيَ بِذنوبِهِ كُلِّها فَوضِعتْ بَينَ عاتِقَيْهِ، فكُلَّما رَكعَ أو سَجَدَ تَساقَطتْ عَنْهُ)) *{صححه الألباني في سلسة صحيحه عن ابن عمر}* .

واتە: (بەندە کاتێك هەڵدەستێت بۆ نوێژکردن هەموو گوناهەکانی دەهێنرێن لەسەر شانی دادەنرێن چەندجار بچێتە رکوع و سوجدە لێی هەڵدەوەرن).

ـ یان دەفەرموێ: ((ما مِنْ مُسلِمٍ يَتَوَضّأُ فَيَسْبِغُ الوُضُوءَ، ثمَّ يَقومُ فِي صَلاتِهِ فَيعلَمُ ما يَقولُ، إلا انتَفَل وهوَ كَيَومِ ولَدَتْهُ أُمُّه)) *{صححه الألباني في صحيح الترغيب عن عقبة بن عامر}* .

واتە: (هەر موسوڵمانێك کاتێك دەستنوێژ دەگرێت، بەجوانی دەستنوێژەکەی بگرێت و پاشان هەڵبستێت نوێژەکەی بکات و بزانێت چی دەڵێت لە نوێژەکەیدا، ئەوە گوناهەکانی لێهەڵدەوەرن تا لە بێ گوناهیدا وەك ئەو رۆژەی لێدێت کە لە دایك بووە).

چەند ئاسانە حەقیقەت لەبەردەستماندا ببێت بە واجب، بەڵکو بۆ واجبێکی قورس کە هەوڵ بدەین لە کۆڵمان ببێتەوە و ڕزگارمان بێت لێی بەخێراترین شێوە، ئا ئەمە حاڵی ئەو کەسەیە کە وا هەستبکات کە کاتە بەنرخەکانی بەفیڕۆ دەدات، یان لەدەستی دەدات بەوەی کە چەند رکاتێکی تێدا ئەنجام دەدات.

"واجب" لە زیهنماندا هەموو کاتێك پەیوەستە بە "قورسایی سەرشان"، ئەمەش زۆر قورسە لەسەر دڵەکانمان، لە ئەنجامدانیدا هەست بە لایەنێکی وەرگرتن دەکەیت، نەك پێدان و بەخشین، چونکە بەشێك لە ئیسراحەت و پشووەکانت دەبات، بۆیە لێرەدا هەستکردن بە خاوبوونەوە و لەشگرانی دەستپێدەکات و

نوێژکردن لەلای بەشێکمان دەبێتە بارگرانی، دەمانەوێ خێرا نەجاتمان بێت لێی و لەسەر شانمانی لابەرین.

ـ پێغەمبەری خودا کە کاتی نوێژەکان دەهات دەیفەرموو ((أَرِحْنا بهِا يا بِلالُ)).

*{رواه العراقي عن بلال بن رباح}* .

واتە: (بە بانگدان بۆ نوێژ بمانخەرە ئیسراحەتەوە ئەی بیلال).

کەواتە پرسیارەکە ئەوەنیە: نوێژت کردووە یان نا؟ لەگەڵ گرنگی ئەم پرسیارە و ترسناکیەکەی، بەڵکو ئەو پرسیارە گرنگە کە لەخۆمانی بکەین لەدوای هەموو نوێژەکان: ئایا ئەو خەڵاتەم وەرگرت کە بۆم دیاری کرابوو لەسەر کردنی ئەم نوێژە یان نا؟ ئایا چێژم لێوەرگرت یان نا؟ لەکاتێکدا من بێاقەت دەبووم لە کاتی کردنیدا، یان لە دوای کردنیدا؟ بەقەدەر ئەوەندە چێژم لێوەرگرت کە بەروبومە دنیاییەکانی کۆبکەمەوە؟ ئەوەندەم لێهەڵکڕاند کە پاشەکەوتی بکەم بۆ رۆژی دوایم؟

وا لە نوێژەکانت بکە کە ببنە بلیتێکی خۆڕایی بۆ گەشتێکی بەچێژ، ناڵێم گەشتێك بە هەموو جیهاندا، بەڵکو گەشتێك بە هەموو بوونەوەردا بۆ لای پاشای گەردوون و دەسەڵاتدارە رەهاکەی.

## سنوورەکانی نێوان ( ئەرك ـ الواجب ) و ( ماف ـ الحق )

زۆر کات لەژیانماندا ئەرکەکان لەگەڵ مافەکان تێکەڵ دەبن، سنوورە جیاکەرەوەکانیان نازانین، نازانین ئەرك لەکوێ کۆتایی دێت تاوەکو ماف دەستپێبکات، لەکوێدا ماف کۆتایی دێت تا ئەرك دەستپێبکات؟

حەجکردن ئەرك و واجب و هیممەت و سەفەرکردن و مەسرەف کردنە، رەنگە مەترسیشی تێدا بێت، بەڵام کاتێك کە بیردەکەینەوە ئەم سەفەرە هەموو هەنگاوێکی خێرێکی لە خۆگرتووە، ئەوکات ئەو هەستکردنە بە ئەرکبوونە، دەبێت

بە هەڵم و لە سەرمان دەچێتە دەرەوە و ڕوانین لێی وەك مافێك جێگەی دەگرێتەوە، تا هیچ هەستکردن بە ئەرکی تیایدا نامێنێت.

خێر و خێراتکردن، ئەرك و بەدواداچوون و مەسرەفکردنە، هەرکاتێك کە ئەنجاممماندا بە رەزامەندی خۆمان و بەو هەستەوە کە پاداشتمان پێدەگەیەنێت و خۆشبەختی دەگەیەنێت بەو کەسەی خێرەکەی پێدەکەین، ئەو کات هەست دەکەین بە بارینی چەندەها رێژنە لە پارێزراوی و ئارامی دڵ، بەوەی کە بەو بەخشینە خودامان پێ ڕازی کردووە لە خۆمان و پێداویستی کەم دەرامەت و خاوەن پێداویستیەکانمان پێ جێبەجێ کردووە و پاراستومانن لە برسێتی و ئارامی و ئەمینیمان پێبەخشیون لە بەرامبەر ناڕەحەتیەکانی ژیان.

ڕۆژوو بریتییە لە ئەرك و فەرز و برسێتی و تیونییەتی و ناڕەحەتی، بەڵام کاتێك دەڕوانین لەگەڵ هەموو خولەکێکیدا هەست بە چێژی نزیکبوون لە خوداوە دەکەین، لەکاتێکدا فەرمانەکانیمان جێبەجێکردووە و دوورکەوتوینەتەوە لەو شتانەی رێگری لێکردووین و کاتی پاداشت وەرگرتنەوەکەمان نزیك بۆتەوە، تەنها بە نزیکبوونەوەی بەربانگکردنەوە نا، لە دوای ڕۆژێکی درێژ لە برسێتی و تینوێتی، بەڵکو لەسەروو ئەوەوە هەستکردنمان بە سەرکەوتن لە شەڕی بێبەشکردنی نەفسمان لە شەهوەت و حەزەکانی، چێژی زیادکردنی خێری زیاتر بۆ ناو حیسابە بانکیەکەمان کە حسابێکی خودایی نەبڕاوەیە.

ئەوە ئەو جیاوازییەیە لە نێوان حەرام و حەڵاڵ، خودای گەورە هیچ شتێکی لەسەر حەرام نەکردووین تەنها لەبەر ئەوە نەبێ کە دەیەوێت بمانپارێزێت لە زیانەکانی، جا جۆری ئەو زیانە هەست پێبکەین یان نا، هەروەها هیچ شتێکیشی بۆ حەڵاڵ نەکردووین و فەرمانی پێنەکردووین تەنها لەبەر ئەوە نەبێت کە سوودمەند بین لە سوود و قازانجەکانی، جا جۆری ئەو سوودە هەست پێبکەین یان نا، دەتوانین بڵێین ئەگەر خاوەنی کەمێك زیرەکی بین و بگەڕێین بەدوای

دەستەواژەیەکی واقیعی ئابووریانە و نەفسیانە و پزیشکیانە بۆ حەڵاڵکراوەکان و حەرامکراوەکان، ئەوا لەبری وشەکانی حەرام و حەڵاڵ، ئەم وشەیەمان بە وشەکانی: "سودبەخشەکان و زیانبەخشەکان" دەردەبڕی.

چەند ئاسانە هەموو مافەکان لەبن چنگماندا هەڵگەڕێنەوە بۆ ئەرکەکان، بەڵام هەروا ئاسان و چێژدارتر و جوانتریشە کە هەموو ئەرکەکانی بەردەستمان بکەین بە ماف. ئەگەر وا ڕێکبکەوێت خەڵاتێکی پارەی زۆر ببەیتەوە لە یەکێك لە دامەزراوەکان و داوات لێبکرێت کە سەفەر بکەیت بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکە، ئایا پەلە ناکەیت بەدڵخۆشیەوە بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە و هەرگیز کات و ماندووبوونت بۆ وەرگرتنی لەبەرچاو ناگریت و هەموو ڕێگریەکانی بەردەم ئەو سەفەرەت لا نابەیت؟ کەواتە خەڵاتی نوێژ شایستەی ئەو کۆششە بەڵکو زیاتریش نییە؟ خەڵاتی نوێژکردن لە کوێی خەڵاتەکانی دنیادایە؟! خەڵاتە دنیاییەکان چەند جیاواز بن چەندە گەورە بن، خەڵاتی خودایی بۆ نوێژ گەورەترە.

چۆن دەتوانی تامی بەروبوومی دارێك بکەی کاتێك دەست ڕانەکێشی بۆ لێکردنەوەی؟ چۆن دەتوانی خەوێکی ئاسودە و خۆش بەسەربەری کاتێك کە جێگەی خەوتنەکەت ڕێك نەخستووە و ئامادەت نەکردووە و پێخەف و سەرچەڤی پێویست و کەشێکی هێمن و ژورێکی نیمچە تاریك و بیدەنگت فەراهەم نەهێناوە؟ ڕاستیان وتووە: "ڕاستە خودا رزق و خۆراکی باڵندەکان فەراهەم دێنێ، بەڵام پێویستە بفڕن و بگەن بە ڕۆزیەکانیان بۆ ئەوەی چێژ ببینن لە بەدەستهێنان و خواردنی".

# چێژی هەستان بۆ نوێژ

کاتێك منداڵ بووم، دەبوو هەستم بۆ نوێژی بەیانی لە "نیوەی شەودا"! — وام بە خەیاڵدا دەهات ئەو کاتە کە نیوە شەوە—، پرسیارم لە خۆم دەکرد: باشە بۆ دەبێت نوێژی بەیانی لەو کاتەی شەودا بێت؟! باشە خودا نایەوێت ئێمە پێنج نوێژی بۆ ئەنجام بدەین، بۆ لەو کاتە قورسەدا ئەم نوێژەی داناوە و دەیەوێت هەستینەوە لەکاتێکدا کە لە خۆشترین کاتەکانی خەوداین بۆ ئەوەی نوێژی بۆ بکەین؟! چ نەنگیەکی تێدایە کە کاژێر حەوت یان هەشت، یان تەنانەت کاژێر دەی بەیانی؟ ئایا نوێژ هەر نوێژ نییە لە هەر کاتێکدا بکرێت؟ ئەوەی دەیخوێنین لەو کاتە درەنگەدا هەر ئەو خوێندنانە نییە لە کاتەکانی تردا دەیخوێنین؟ باشە ئەگەر نوێژ بۆ پەیوەستبوونە بە خوداوەوە و دوورکەوتنەوەی شەیتانە لێمان، شەیتان چ کاریگەریەکی هەیە لە سەرمان لەو کاتەدا کە ئێمە لە قوڵایی خەوداین؟ بۆ دەترسین پەیوەستبوونمان بە خوداوە لەدەستبدەین و پێمان هەڵخلیسکێت بۆ پەیوەستبوون بە گوریسەکانی شەیتانەوە، مادام ئێمە خەوتووین و ناتوانین لە بنەڕەتدا هەر بیربکەینەوە بەهیچ شێوەیەك، یان پلان دابنێین بۆ خێر یان بۆ شەڕ؟

ئەم پرسیارانە ڕەنگە بە گوێی گەورەکانیشدا بێن نەك هەر منداڵاندا بەتەنها، بەڵام گەورەکان لە کۆتاییدا هەست دەکەن کە نوێژکردن تەنها پەیوەندیەکی خولی (دوري) نییە لەگەڵ خودای گەورە و بەس، بەڵکو بەرنامەی ژیانە وەك لەمەودوا تێی دەگەین..

کەسێك شیرینی هەستان بۆ نوێژی بەیانی بچێژێت، پاشان تامی ڕۆیشتن بۆ مزگەوت بکات لەگەڵ بانگدا، پێش ڕۆژهەڵاتن لە مزگەوت دەربچێت بۆ سەر کاری ڕۆژانەی خۆی، هەر کارێك بێت، ئەو مرۆڤە قەدری زوو هەستان هەست پێدەکات، هەر خۆی نرخی هەڵمژینی سروەی پاکی بەیانیان دەزانێت و چێژ لە ئارامی بەیانیان و نزیکی ڕێگا لە نێوان خۆی و خودای گەورەدا دەکات، هەر لە کاتی

نوێژی بەیانیدا نا، بەڵکو لە ناو نوێژەکە و لە دوای نوێژەکەش.

بەڕاستی ئەو کەسەی ئامادەی نوێژی بەیانی دەبێت، ئامادەی زیندوویێتی ژیان لەدوای خامۆشبوونی دەبێت، شەو کاتێك رۆژی لێدادەڕنێت و هێڵە سەرەتاییەکانی بەیانی لە زایەنگای شەو بە بەرچاوەکانەوە لەدایك دەبن، ئەرز و ئاسمان و دارودەوەن و گژوگیا و گوڵەکان پەردەکانیان لەسەر خۆیان لادەبەن و بەشەرمەوە پەچەی روویان هەڵدەماڵن و ژیانێکی نوێیان بەبەردا دەکرێت، بەڕاستی مرۆڤ لە بەیانیانی زوودا لەبەردەم نمایشێکی بچوککراوەی رۆژی یەکەمی دروستکردنی خودایی سەرسوڕهێنەردایە بۆ بوونەوەر، کە چۆن دروست دەبێت، لەبەردەم موعجیزەی تێکەڵبوون و چوونە ناویەکدی رۆژ و شەودایە کە چۆن روودەدات، لەبەردەم نموونەی زیندووبوونەوەی یەکەمدایە بۆ ژیان کە چۆن وردە وردە بە ڕەگ و ریشاڵی بوونەوەردا بڵاودەبێتەوە، بەشێوەیەك هەرکەسێك بەو چاوەوە دیمەنی کاژێرە تایبەتەکانی بەیانیان ببینێت، عەقڵ و مەلەکە و بیری بەشێوەیەك دەکرێتەوە بەرەو لەدایکبوون و بەخشین، کە وزە و پاراوی و چالاکی و بەرهەم و داهێنانی زیاتری پێدەبەخشێت، وەك ئەوە وایە کە ژیانێکی نوێی بەکارنەهاتووی پێبەخشرابێت.

ئەوە بەیانییە، چاوێکی تایبەتت پێدەبەخشێت کە نهێنیەکانی بوونەوەری پێ ببینیت، ئیعجازی دروستکراوەکانی چواردەورت بۆ ئاشکرا دەکات، کە لە کاتەکانی تری رۆژدا بێجگە لە بەیانیان بۆت ئاشکرا نەدەبوون و نەتدەتوانی ئاشکرایان بکەیت.

کەسێك کە زوو هەستانی بەیانیان و کارکردن لە کاژێرەکانی سەرەتایدا تاقیکردبێتەوە، بەتەواوی هەست دەکات بەوەی کە کارکردن لەو دوو یان سێ کاژێرەی یەکەمدا بەروبوومەکەی چەند قات بەرامبەرە لەگەڵ چەندین کاژێری دورودرێژی تری رۆژدا، بەڕاستی ئەوەی لەنێوان تۆ و ئەو کاژێرە پڕ فەڕ و

تایبەتانەدان شەیتانی نوستنەکەتن، بۆیە ئەگەر رۆژی یەکەم سەرکەوتوو بوویت لە بەرەنگاربوونەوەی، پاشان رۆژی دووەمیش بەهەمانشێوە توانیت و پاشان چەند رۆژێکی لەسەر یەك ئەم کارەت کرد، ئەوە رادێیت لەسەر ئەوەی کە زوو هەستان دەکەیتە بەڵێن و پەیوەستبوون بۆ خۆت وەك چۆن رۆژووەوان پەیوەستە بە رۆژووەکەیەوە لە رۆژە قورسەکانی یەکەمی رەمەزاندا، ئەگەر ئەم کارەت کرد ئەوە ئەم بابەتە دەبێتە خوویەکی چەسپاو لە پێکهاتەی فیزیایی تۆ و بەشێکی چێژدار لە بەرنامەی رۆژانەت و ناتوانیت دەستبەرداری بیت و وازی لێبێنیت.

ئەوەتا تۆ چاوەکانت هەڵدێنیت و تا ئێستاش هەر لەناو جێگەکەتدایت، ئەوەش شەیتانە سەرت بە پشتییەکەتەوە گرێدەدات و پێتدەڵێت: چاوەکانت بنوقێنە ئازیزەکەم خۆت تەسلیم بە خەو بکە، ئەم بێئاگاییە خۆشە لە قیس خۆت مەدە لەم کاژێرە زووانەی بەیانیدا، چونکە ئەم کاتە خۆشترین کاتەکانی ئیسراحەت خاوبوونەوە و تەمبەڵی خەوی قووڵن، پەلەت چییە؟

ئەوە ئەو گفتوگۆیەیە کە هەموو بەیانییەك بەئیلحاحەوە دووبارە دەبێتەوە، باشە ئەی چۆن رووبەڕووی هەڵخەڵەتاندن و وەسوەسەکانی ببینەوە؟ ئەمە ئەو بابەتەیە کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) بۆمان شیدەکاتەوە، هەوڵدەدات یارمەتیمان بدات لەسەر تێپەڕاندن و زاڵبوون بە سەریدا، وەك دەفەرموێ:

ـ ((يَعقدُ الشَّيطانُ عَلى قافيةِ رَأسِ أحدِكُم إذا هوَ نائِم ثَلاثَ عُقَدٍ يَضرِبُ كُلَّ عُقدَةٍ مَكانَها – أيْ يَخْتِمُ عليها بِخَتمةٍ–: عَلَيكَ لَيْلٌ طَويلٌ فَارقد، فَإِنْ استَيقَض فَذَكَرَ اللهَ انحَلَّتْ عُقدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَأَ انحَلَّت عُقْدَةٌ، فإِنْ صلّى انحَلَّت عُقَدُه كُلُّها فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النفس، وإلاّ – أي إن لم ينهض للصلاة– أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفسِ كَسلانَ)) *{رواه البخاري عن أبي هريرة}*. واتە: (شەیتان سێ گرێ لە پشتەملی هەریەکەتان دەدات کاتێك کە خەوتوون، هەر گرێیەکیان لە شوێنێك مۆری لێدەدات، دەڵێت: شەوێکی

درێژت لەسەر بێت بخەوە، ئەگەر هەستا و زیکری خودای کرد ئەوە گرێیەك دەبێتەوە، ئەگەر هەستا و دەستنوێژی گرت گرێیەکی تریش دەکرێتەوە، ئەگەر نوێژی کرد ئەوە هەموو گرێیەکانی دەکرێنەوە و ئەو بەیانیە چالاك و دڵ ئاسودە دەبێت، ئەگەر نا — واتە ئەگەر هەڵنەستا بۆ نوێژ– ئەوە بەیانی دەکاتەوە بەدڵێکی توند و پیس و تەمبەڵەوە).

ئایا هیچ جارێك هەوڵتانداوە بەهرەمەند بن لە سەیرکردنی دەموچاوی ئەو کەسانەی کە لە سەرەتای شەودا دەخەون بۆ ئەوەی زوو هەستن بۆ نوێژی بەیانی، بەراوردی بکەن بە دەموچاوی ئەو کەسانەی کە تا کۆتایی شەو ناخەون و پاشان کە هەڵدەستن کاتی نوێژ بەسەرچووە؟ ئەگەر ئەم کارە بکەن ئەوە هەندێك لە نهێنیەکانی ئەم ئامێرە سەیرەتان بۆ روون دەبێتەوە کە ناوی "مرۆڤە"، کە دروستکەرەکەی یاسایەکی فیزیایی سەیری وای تێدا داناوە کە دەڵێت: "چاکترین کات بۆ وەگەڕخستنەوەی ئەم ئامێرە — مرۆڤ — پێش رۆژهەڵاتنە، نەك دوای رۆژهەڵاتن، ئاوا ئەم مرۆڤە نەخشەکێشراوە لەلایەن دروستکەرەکەیەوە لەبەر هەر دانایی و حیکمەتێك کە دەکرێ یان ناکرێ تێی بگەین، جا کێ هەیە زیاتر لە دروستکەرەکەی هەموو نهێنیەکانی ئەم ئامێرە مرۆڤیە تێبگات لەو نهێنیانەی کە تا ئێستا ئاشکرا بوون بۆمان، یان ئەوانەی ئاشکراش نەبوون بۆمان؟ ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ {الملك: ١٤}. واتە: (مەگەر خوا نازانێت کێی دروست کردووە و چۆنی دروست کردووە، لەکاتێکدا ئەو زاتە وردەکار و بەسۆز و بەئاگایە).

سروشت فەرشی خۆی راخستووە بۆ مرۆڤەکان، وەکو بەرنامەڕێژی بۆ کراوە لەلایەن بەدیهێنەرەکەی، بۆ ئەوەی لە هێڵی یەکەمی بەیانیەوە هەموو شتە جوانەکانی ژیان بۆ تۆی مرۆڤ روناك بکاتەوە لە چواردەورت، نەك بۆ ئەوەی بخەویت، بەڵکو بۆ ئەوەی هەستیت و شت بەرهەم بێنیت و زەوی ئاوەدان بکەیتەوە، بۆیە ئەم نیعمەتە خودابیە بێڕەواج مەکە و ئەم وزە زۆرەی بەیانیان

بەزایە مەدە کە خودای گەورە بۆ تۆ و بوونەوەرەکانی چواردەورتی خوڵقاندووە بۆ ئەوەی دەست بە رۆژێکی تازە بکەن، ئایا سەیری ئەو گوڵانەت نەکردووە کە پێڵوەکانیان داخستووە لەگەڵ رۆژ ئاوابووندا، کەچی لەگەڵ یەکەم هێڵی بەیانیدا چاوەکانیان هەڵدێننەوە و پێڵووەکانیان دەکەنەوە؟ سەیری ئەو باڵندانەت نەکردووە بەو بەیانیە زووە دەست دەکەن بە خوێندن و دەفڕن بۆ گەڕان بەدوای رزق و رۆزیەکەیاندا؟ سەیرت نەکردووە مانگا و مەڕ و بزن و مریشك و هەموو ئەو بوونەوەرانەی کە خودا لەسەر زەوی دروستی کردوون، کاتێك کە بەچوست و چالاکییەوە هەڵدەستن لەگەڵ یەکەم هێڵی بەیانیاندا بۆ ئەوەی خولێکی تری ژیان دەست پێبکەنەوە هەموو رۆژێك؟

بۆیە فریای ژیان بکەوە و بەروبوومەکەی بچنەوە، پێش ئەوەی شەمەندەفەرەکەی بەجێت بێڵێت بەبێ گەڕانەوە.

## چێژی خۆڕاگری (الاصطبار)

کاتێك کە ئۆتۆمۆبیلێك لێدەخورین و دەڕۆین بۆ کارێك یان شوێنێك، هەموو مەبەستێکمان ئەوەیە بگەینە ئەو شوێنە و دڵمان بەلای هیچ کارێکی تردا نەڕوات و خۆمان خەریك نەکەین بە هیچی ترەوە، بە کۆتا خێرایی رێپێدراوەوە، رەنگە رێپێنەدراوەوە، کار لەسەر گەیشتن دەکەین، بۆ ئەوەی بگەینە ئەو شوێنە، بەڕاستی ئەمە رێگەیەکی ناوازەیە بۆ بەملدایەکدانی واجباتەکان بە سەرسەری خۆماندا و بەتەلەفدانی دەمارگەل (أعصاب)مان.

باشە چی دەبێت ئەگەر ئۆتۆمبیل لێخوڕینەکەمان وا لێبکەین کە چێژی لێوەربگرین، بەشێوەیەك کە لەگەڵ کاتی لێخوڕینەکەدا بژین و خوڕاگر و بەئارامبین لە لێخوڕیندا؟ تۆزێك زوو بچینە دەرەوە بەشێوەیەك کاتێ پێویستمان ببێت بۆ لێخوڕینی ئۆتۆمبیل بەهێدی و نەرمی، بەم شێوەیە مۆڵەتی چاوگێڕانمان بۆ

دیمەنەکانی ڕێگە دەبێت و دەتوانین چێژیان لێوەربگرین؟

ئایا کاتی زیاد بۆ گەشتەکانت تەرخان دەکەیت بۆ ئەوەی بیکەیتە مایەی چێژبینین بۆ خۆت و بۆ ئەوانەش کە لەگەڵتدان؟ ئایا بەڕاستی بەچێژەوە ئەنجامیان دەدەیت، نەك بەشێوەیەك کە بارگرانی بێت بۆ خۆت و بۆ ئەوانەش کە لەگەڵتدان؟ دە ئاواش بکە لەگەڵ نوێژەکانت.

بەڕاستی ئەم مەسەلەیە تەنها پێویستی بە گرێدانی ڕێکەوتنێکە، تەنها ئاگربەستێکی کورت لەگەڵ کاتدا هاوکاریت دەکات لەسەر خۆڕاگری، بەشێوەیەك کە هەر ئارامگری بۆخۆی دەکاتە بابەتێکی بەچێژ، باشە تۆ تام و چێژی ئارامگرتنت لەسەر بەڕۆژووبوون تاقینەکردۆتەوە تا کاتی ڕۆژوو شکاندن؟ یان ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتیەکان تا لاچوونی ناڕەحەتیەکە؟ یان ئارامگرتن لەسەر نەخۆشی تا چاکبوویتەتەوە؟ یا ئارامگرتن لەسەر ریزبەستن بۆ چوونە ناوەوەی هۆڵی ئاهەنگ تا ڕێگەت دراوە بۆ چوونە ژوورەوە؟ یان ئارامگرتن لە سەر خوێندن و سەعیکردن تا دەربچیت؟

ئایا هیچ کاتێك چێژی خۆڕاگریت کردووە بەوەی خۆت مەحروم کردبێت لە شتێك کە لە تواناتدا هەبووبێت بیکەیت یان بیخۆیت؟ ئایا تاقیت کردۆتەوە کاتێك تۆ توانیبێتت پارچە شیرینییەك یان کراسێکی تازە، یان سەیارەیەکی نوێ بکڕیت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەتکڕیبێت، چونکە ویستووتە پابەند بیت بە سەرگە — مبدأ— یان بەڵێنێك، یان وەفاکردن بە پەیمانێك یاخود لەبەر تەوازوع بێلاف یان لەبەر ڕێز بۆ ئەو کەسانەی کە لەگەڵتدان و پارەی کڕینی ئەو شتەیان نییە؟ ئەوەیە چێژی خۆڕاگری — الاصطبار—، خۆڕاگری لەسەر نوێژیش بەم شێوەیەیە:

— ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ {طه: ١٣٢}. واتە: (فەرمانبدە بە هەموو تاکەکانی خێزانەکەت تا نوێژەکەیان بەچاکی ئەنجام بدەن بەردەوام و کۆڵنەدەر و خۆڕاگربە لەسەری).

خۆڕاگریت لەسەر نوێژ مانای تەنگاوبوون و تاقیکرنەوە و سزا نییە لە لایەن خودای گەورەوە، بەڵکو خۆڕاگری کردنەکەت پەیوەستە بە جۆر و چەندێتی ئەو چێژەی کە دەیچنیتەوە لەسەری، چەندە بتەوێ پاداشتت گەورەتر بێت دەبێت خۆڕاگریەکەت زیاتر بێت لەگەڵ زیادبوون و گەورەبوونی چێژوەرگرتنت لە نوێژەکان، ئایا هیچ چێژێك هەیە بەقەدەر ڕاوەستان لە بەردەم خولقێنەرەکەتدا گەورەتر و خۆشتر بێت، بۆ ئەوەی چپەکانی دڵتی تێدا دەرببڕیت، لەبەر پێی دەرگاکەیدا خەفەت و ئازارەکانت لەسەر شانت هەڵبڕێژیت، بۆ ئەوەی لە دوای ئەو چاوپێکەوتنە دۆستانە پڕ خۆشەویستیەدا بەشێوەیەك دەربچی کە پاك بووبێتەوە لە هەموو گوناهەکانت و سەرلەنوێ لەدایك بیتەوە؟

## نوێژ قوتابخانەی ئارامگرتنە

سەرم سوڕماوە لە ونیی قسە و باس سەبارەت بە فەزیلەتی ئارامگرتن لە ئەدەبیاتی رۆژئاواییدا، ونیەکی نزیك لە نەبوون و باسکردن، بەشێوەیەك کە لەلای ئەوان لەنێو فەزیلەتە سەرەکیەکانی مرۆڤایەتیدا هیچ جێگایەك نابینیت بۆ ئەم فەزیلەتە، خوێنەرانی نوسراو و ئەدەبیاتی رۆژئاوایی ئەوانەی کە لە من زیاتر خوێندنەوایان هەیە بۆ ئەدەبیاتیان گەواهی ئەم راستییە دەدەن، ئەوان زۆر باسی ئازایەتی و راستگۆیی و بڕیاردان و کارکردن و سەخێتی و پیاوەتی و فریاکەوتن و بەردەوامی و دڵسۆزی و خۆشەویستی و دادپەروەری و یەکسانی و ئازادی و دیموکراتی و بێفیزی و یارمەتیدانی کەم دەرامەت و هەژاران و خاوەن پێداویستییەکان..و زۆر رەوشتی تر دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا کەچی جێگەی سەرسوڕمانە کە بیریان نەکردۆتەوە رۆژێك لە رۆژان باس لە خەسڵەتی ئارامگرتن بکەنەوە، لە بەرامبەریشدا دەبینین کاتێك کە سەیری وشەی ئارامگرتن (الصبر) و وشە لێوەرگیراو (مشتقات)ەکانی دەکەین لە قورئانی پیرۆزدا دەبینین کە لە (١٠٣)

جار کەمتر دووبارە نەبۆتەوە، بێجگە لەوەی کە سەدان جار لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خودادا باسی لێوە کراوە.

بۆیە من بەسەرسوڕمانەوە دەڵێم کاتێك سەیری شارستانییەتی رۆژئاوا دەکەم بەو شێوەیە خۆی سەپاندووە بەسەر جیهاندا بە دۆزینەوە و داهێنانەکانی، لەکاتێکدا هەموومان دەزانین کە ئارامگرتن یەکەم چەکە کە دۆزینەر و داهێنەر خۆیانی پێ پڕ چەك بکەن لە بەسەربردنی زۆربەی شەو و رۆژەکانیاندا لە تاقیگەکاندا، شان دابدەن بە ئارامی لەسەر تاقیکردنەوەکانیان، بەنەرم و هێدی گەڕان بۆ دۆزینەوەی شتی نوێ هەنگاو بنێن، کۆڵنەدەرانە کاربکەن لەسەر ئەو شتانەی کە خەڵکی تر نەیانتوانیوە ئەنجامی بدەن، باشە داهێنەران چۆن دەتوانن دۆزینەوە و داهێنان بکەن بەبێ کۆڵنەدان و بەردەوامبوون و زۆر لە خۆنەکردن و ئارام نەگرتن؟ رەنگە ئەوەی کە ئەمانە بەدەستیان هێناوە لە بواری دۆزینەوە و داهێنانە زانستیە ناوازەکاندا، لە دەستگرتنیان بەسەر جیهاندا لە ڕووی فیکر و زمان و خاکەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئارامگرتن و زۆرلەخۆکردن و دەستبەرنەدان لە شتەکان پایەی چەسپیو بن لەناو سروشتی مرۆڤایەتیاندا، رەنگە پێویستیان بە باسکردنی ئارامگرتن و چەکەکانی نەبێت لە ئەدەبیاتیاندا.

ئەگەر بەوردی سەیری گرنگترین سێ عیبادەتەکەی ئیسلام – نوێژ و رۆژوو و حەج – بکەیت، دەبینیت هەر یەکێکیان وەك قوتابخانەیەك دەبینرێت کە دانراوە بەتایبەت بۆ راهێنان لەسەر ئارامگرتن، بۆ پێگەیاندنی ئارامگران تیایدا، رەنگە بڵێیت ئەوە رۆژوو و حەج ئارامگرتن تیایاندا دیار و ئاشکرایە، بەڵام پەیوەندی نوێژ بەئارامگرتنەوە چییە؟

بیهێنە پێش چاوی خۆت، ئەگەر بەشداری بکەیت لە خولێکی پێگەیاندن سەبارەت بە ئارامگرتن و راهێنان لەو بارەیەوە، ئایا بیر دەکەیتەوە چ جۆرە بەرنامەیەك و وانەیەکت پێبڵێن لەم خولەدا؟

ئەگەر نوێژکردن بەبێ خشوع و ملکەچی بە نوێژێکی تەواو دانەنرێت، بەشێوەیەك کە نوێژخوێن "بزانێت چی دەڵێت" وەك لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خودادا ئاماژەی پێدراوە، ئایا ئەم ملکەچی و خشوعە بەبێ ئارامگرتن دێتە دی؟

چەند ئاسانە و چەند بازرگانیەکی سووکە، بەڵام چەند بێ قازانجە کە بەخێرایی نوێژەکەت تێپەڕێنیت و ئایەت و زیکرەکانی بەخێرایی و بێئاگایی بخوێنیت، بەو شێوەیەی کە بۆخۆشت نەزانی چی دەڵێیت، چەند قورس و بازرگانیەکی پڕ فەڕ و خێرە و چەندەها خێر و چاکە چاوەڕوانت دەکات کە وشە بە وشە زیکر و ئایەتەکانی نوێژەکەت بخوێنیت و هەڵوێستە بکەی لەسەر ئەو شوێنانەی کە پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکرێن، بەشێوەیەك کە بزانیت چی دەڵێیت.

وتنەوەی دەستەواژەی دەسپێکی نوێژ (الله أکبر) لە ناو قەڵەباڵخی ئیش و کارەکاندا پاشان راوەستان بەشێوەیەك کە ناخ و دەروونت پڕ بکەیت لە یادی خودا، بپرسی: الله أکبر لە چی؟ و بۆچی؟ ئەمە کارێکە پێویستی بە ئارامگرتن هەیە، بەڵکو ئارامگرتنێکی زۆری دەوێت.

دووبارە وتنەوەت لەنێو ئەو جەنجاڵیەی کارەکانتدا بۆ ئەو زیکر و تەسبیحاتانەی ناو نوێژ (سبحان ربي العظیم، سبحان ربي الأعلی) پاشان هەڵوێستەکردنت و لەخۆپرسینت: بە پاك و بێگەردگرتنی خودای گەورە لە چی و بۆچی؟ بە گەورەزانینی خودای گەورە بۆچی؟ ئەمە پێویستی بە ئارامگرتن هەیە، بەڵکو ئارامگرتنێکی زۆری دەوێت.

درێژکردنەوەت لە ناو قەڵەباڵخی ئیش و کارەکانتدا بۆ هەریەکە لە وشەکانی: (بسم الله) و (الرحمن) و (الرحیم) وەك چۆن پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) فەرموویەتی و وتوویەتی، بەشێوەیەك بەتەواوی مانای هەریەکەیان تێبگەیت و کەسایەتی و تایبەتمەندی و جیاوازی هەریەکەیان جیابکەیتەوە لەوی تر – وەك باسی دەکەین– ئەمە پێویستی بە ئارامگرتن هەیە، بەڵکو پێویستی بە

ئارامگرتنی زۆریش هەیە.

هەڵوێستەکردنت لەناو قەڵەباڵخی ئیش و کارەکاندا، لە دوای وتنی هەریەکە لە وشەکانی (التحیات لله) و (الصلوات) و (الطیبات) بەشێوەیەك لەسەر هەموو راوەستانێکت چێژی وەڵامدانەوەی خودایی هەست پێدەکەیت، پاشان سەلامکردنت لە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) چاوەڕوانی چێژی بیستنی وەڵامدانەوەکەی و.. هەروەها چێژی سەلامکردن لە بەندە چاکەکان (عباد الله الصالحین) و چێژوەرگرتن لە وەرگرتنی پاداشتی سەلامکردنەکەت لە هەموویان — وەك بە درێژیی باسی ئەم بابەتە دەکەین لەمەودوا – هەموو ئەمانە پێویستی بە ئارامگرتن هەیە، بەڵکو ئارامگرتنێکی زۆر.

هەڵویستەکردنت لەناو قەڵەباڵخی ئیش و کارەکاندا، لە نێوان جوڵە بۆ جوڵە و بۆ هەستان و دانیشتنەکان و خوێندنی زیکرەکان و ئایەت بۆ ئایەتەکان بەشێوەیەك هەریەکەیان بە تەواوەتی مافی خۆی پێبدەی لە رووی جدیەت و راستگۆیی و رێژەوە بۆ ئەوەی جێگەی قەبوڵ بێت لەلای خودای گەورە — وەك لە لاپەڕەکانی داهاتوو باسی دەکەین– ئەمانە هەمووی پێویستیان بە ئارامگرتن هەیە، بەڵکو ئارامگرتنێکی زۆر. ئەگەر وردبیتەوە لە هەموو سەرکەوتنەکانت، هەموو دەستکەوتنەکانت، دەبینیت لە پشتیەوە ئارامگرتنێکی زۆر هەیە، ئەگەر سەیری هەموو سەرنەکەوتنێك و دۆڕانێك و هەموو تاوانەکان و هەڵەکانت بکەیت، دەبینی لە پشتییەوە کەمیی ئارامگرتن و بێ سەبری هەیە.

ئەم ئارامگرتنە چ قوتابخانەیەکی سەرسوڕهێنەرە لە تاقیکردنەوە دنیاییەکاندا بۆ سەرکەوتن، چ قوتابخانەیەکی سەرسوڕهێنەرە تاقیکردنەوەی ئارامگرتن بۆ نوێژکردن؟!

ئەگەر خودای گەورە تووشی خێر و چاکەی کردیت و ئارامت گرت تووشی لە خۆبایی بوون و لوتبەرزی نەبوویت، ئەوە دەبێتە هۆی خێری زیاتر بۆ دین و دنیات.

ئەگەر تووشی زیان و زەرەر بوویت لە دنیادا و ئارامت گرت لەسەر ناڕەحەتیەکانی و تووشی بێهیوابوون و لاوازی نەبوویت، ئەوە دەبێتە هۆی خێری زیاتر بۆ دین و دنیات.

ئەگەر ویستت خێرێك بکەیت و ئارامت گرت لەسەر ئەزیەت و دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی، تووشی دوودڵی و لاوازیی نەبوویت، ئەوە دەبێتە هۆی خێری زیاتر بۆ دین و دنیات. ئەگەر شەیتان ویستی خراپەیەکت پێبکات و تۆش ئارامت گرت لەسەر وەسوەسەکانی و تەسلیمی هاندان و هەڵخەڵەتاندنەکانی نەبوویت، ئەوە دەبێتە هۆی خێری زیاتر بۆ دین و دنیات. ئەگەر خراپەیەکت بەرامبەر کرا و تۆش ئارامت گرت و توڕەیی و رقەکەت خواردەوە و لەو کەسە خۆش بوویت کە خراپەکەی کردووە بەرامبەرت، ئەوە دەبێتە هۆی خێری زیاتر بۆ دین و دنیات.

لە کۆتاییدا مافی خۆمانە بپرسین ئایا هیچ کردەوەیەکی سوودبەخش هەیە لەم دنیایەدا کە پێویستیمان بە ئارامگرتن نەبێت لە کردنیدا؟ چ قوتابخانەیەك هەیە کە ئێمە رابهێنێت لەسەر ئارامگرتن لە قوتابخانەی بەندایەتیی و پەرستشەکان (العبادات) چاکتر بێت، لەسەروو هەمووشیانەوە قوتابخانەی نوێژ؟

پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر) دەفەرموێ: **"أَوَّلُ شَيءٍ يُرفَعُ مِنْ هذهِ الأُمَّةِ الخُشُوعُ"** *{رواه الطبراني بإسناد حسن، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب}*. واتە: (یەکەم شت کە هەڵدەگیرێتەوە لەناو ئەم ئوممەتەدا خشوع و ملکەچیە لە نوێژدا)، وەك بڵێی کە خشوع هەڵگیرا لە نوێژەکانماندا ئارامگرتنیش هەڵدەگیرێت، کاتێك ئارامگرتنیش هەڵگیرا ئەوە شارستانیەتی ئەم ئوممەتەش هەڵدەگیرێت.

ئەوە نییە خودای گەورە ئەم راستییە زیندووەی بۆ پشتراستکردوینەتەوە کاتێك سەرکەوتنمانی لە زەویدا گرێداوە بە خشوع و پەیوەستبوونمان لە نوێژدا بە ئاسمانەوە، کاتێك دەفەرموێت: ﴿**قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ**

خَاشِعُونَ﴾ {المؤمنون:١-٢}. واتە: (بەڕاستی بڕواداران سەرکەوتوو و سەرفراز بوون، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچ و دڵئارام و دڵ دامەزراون و دڵیان لەلای خودایە). لەدوای هەموو نوێژێك لە خۆت بپرسە: ڕێژەی پاشەکەوتی ئارامگرتنت چەندە کە لەم نوێژە دەستت کەوتووە؟

## بۆچی نوێژ دەکەین؟

نوێژکردن بۆچی؟ لەبەر ئارامگرتن و بەس؟

بۆچی هەموو ڕۆژێ کاژێرێك یان دووان لە کاتی خۆمان بەفیڕۆ دەدەین لە ئەنجامدانی هەندێك جوڵە و هەستان و دانیشتنی تایبەتدا؟ لە وتنەوەی چەند دەستەواژە و وتەیەك کە سەدان جار دووبارەمانکردۆتەوە؟ باشە باشتر نەبوو ئێمە ئەو کاتە لە یارمەتیدانی خەڵکدا بەخەرج بدەین، یان هەر کارێکی خێری، یان مرۆڤایەتی تر؟ باشە چی دەبوو ئەگەر نوێژ نەبوایە؟

بیهێنە پێش چاوی خۆت، ئەگەر ئێستا لە پڕ هەموو هێڵە تەلەفۆنیەکانی جیهان هێڵی زەمینی و ئاسمانی و هەموو هێڵە تەلدار و بێتەلەکان لە کار بکەون و بپچڕێن، ئینتەرنێت و هەموو وێستگە ئاسمانی و زەمینیەکان ڕابوەستن، هەموو ڕێگە ئاسمانی و زەمینی و دەریاییەکان لەکار بکەون، و.. و.. دەبینیت لە جیهان چی ڕوودەدات؟ چ فەوزایەك، چ مایەپوچییەك، چ فەوتانێك، چ داڕمانێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری و شارستانی؟

ئەوە ئەو ڕۆڵەیە کە نوێژ دەیبینێت لە نێوان ئێمە و دروستکەرەکەماندا، ئایا دەکرێت ڕۆژێك لە ڕۆژان لێی بێنیاز ببین؟ چی ڕوودەدات کە هێڵی گەرمی پەیوەندی نێوان ئێمە و خولقێنەرەکەمان بپچڕێت؟ ئەگەر ئەوە ڕوویدات، دەبێت بۆخۆمان دەست بکەین بە داهێنان و چاککردنەوەی ئەو ئامێرە پەیوەندییە سەرسوڕهێنەرەی کە خودا پێی داوین.

باشە هیچ شێوازێکی چاکتر دەدۆزینەوە لەو "پێکهاتە" یان "شێوازە" سەکەوتووە بۆ پەیوەندی لە نێوان ئێمە و خولقێنەرەکەماندا لە نوێژ و پێکهاتەکانی باشتر بێت؟ ئەمە چ جۆرە رێکارێکی نائاسایی، یان چ پێکهاتەیەکی ناوازە و چ کۆمەڵە وشەیەکی وردی هەڵبژێردراوە، چ هەڵسان و دانیشتن و جوڵەیەکی تایبەتی ئامانجدارە لەناو نوێژدا، کە ئەم عیبادەتەی لەسەر بنیاتنراوە؟

## نوێژ جارێکی تر بەرنامەمان بۆ دادەبەزێنێتەوە

هەروەکو چۆن شەپۆلەکانی دەریا بە تێپەڕنی رۆژگار و ساڵەکان، بەردی کەنارەکانی دەڕنێت و تووشی خۆرکەیان دەکات، ژیانیش ئاوا بە ئێمە دەکات، کە خۆی دەبینێتەوە لە کات و ئولفەت و دووبارەبوونەوەی شتەکان و راهاتن لەگەڵ دەوروبەردا.. نوێژیش ئاوەها کاریگەری لەسەر دەروونمان دروست دەکات لە ڕووی بەهێزکردن و هاوسەنگی و پاککرنەوە لە پیسی و پۆخڵیەکانی ژیانی رۆژانە، بۆیە ئەو پێکهاتە دنیاییانەی چواردەورمان هەوڵدەدەن بە شەپۆلە بەهێز و یەك لە دوای یەکەکانی بە ویست و ئارەزووی خۆیان بەرنامەمان بۆ دابنێنەوە، کاژێر لە دوا کاژێر، رۆژ لەدوای رۆژ، ساڵ لە دوای ساڵ، بەشێوەیەك هەست ناکەین کە لەگەڵ زەمانەدا گۆڕاوین بەشێوەیەك نازانین کە چەندە دووریان خستوینەتەوە لەو شێوە رەسەنە سروشتییەی کە خودای گەورە لە سەری دروستی کردووین و بۆی داناوین، ئەو "سیدیە نورانیە"ی هیچ "ڤایرۆسیك"ی لەخۆنەگرتووە، جاری وا هەیە رێڕەوی بەرنامە رەسەنەکە لاڕێ دەکات و دووری دەخاتەوە لە ئەصڵە ئاسمانیەکەی.

ـ ((إِنَّ الإيمانَ لَيَخلَقُ – أي يَهتَرِيءُ– في جَوفِ أَحَدِكُم كَما يَخلَقُ الثَّوبُ، فاسألوا اللهَ تَعالى أن يُجدِّدَ الإيمانَ في قُلوبِكُم )) *{صححه الأباني في صحيح الجامع، عن عبد الله بن عمر}* .

واتە: (بیروباوەڕ کۆن دەبێت لە دەروونی هەریەك لە ئێوە وەك چۆن جل و بەرگ کۆن دەبێت، بۆیە داوا لە خوای گەورە بکەن خودای گەورە ئیمانەکانتان نوێ

بکاتەوە).

له فەزڵ و چاکەی خودایی بەسەر ئێمەوە ئەوەیە کە بەدەر لە هەموو ئوممەتان و ئاینەکانی تر تا ئێستا ئێمە نوسخەی رەسەنی ئەو "سیدیە نورانی"ەمان لەلا پارێزراوە کە بۆ بەرنامەکانی بیروباوەڕمان هاتووە، بەشێوەیەك دەتوانین بگەڕێینەوە بۆی و دووبارە بەرنامەکان لە سەری دابەزێنینەوە بۆ دەروونمان، هەستین بە چاککردنەوەی و هەموو ئەو بەشە خراپبوو و "ڤایرۆس"، یان "لادان"، یان نەخۆشییانەی تووشی بووین.

ئەوە ئەو نوسخەیەیە کە هەتا ئێستا بەرنامەی قورئانی پیرۆزی بۆ پاراستوین وەك ئەوەی کە هاتۆتە خوارەوە بەتەواوی، بەبێ گۆڕین و لاڕێبردن و زیادکردن و کەمکردن، ئەو نوسخەیەی کە بەرنامەکانی نوێژی پێغەمبەری خودای لە ڕووی گوفتار و هەڵسوکەوتەوە بۆ پاراستوین لە ڕێی ریوایەتی حەرفی چەسپاوەوە و لە چەند ڕێگایەك یەقینی باوەڕپێکراو و چەندین "راوی" گێڕەرەوەی عادل و راستەوە، کە لەم نوسخەیەدا پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) راستی نوێژ و بەرنامەکەیمان بۆ کورت هەڵدێنێت لەسەر چوار وشە، کە بریتییە لە ((صلُّوا كَما رَأَيتُمُونِي أُصَلِّي)) *{صححه الألباني في صحيح الجامع، عن مالك بن حويرث الليثي}*.

واتە: (نوێژ بکەن بەو شێوەیەی کە دەمبینن نوێژ دەکەم).

باشە ئەگەر نوێژ نەبوایە، دەمانتوانی لە ژیانماندا نوێژێك دابهێنین کە بمانگەیەنێتە ئەو خودا گەورە رێکخەرە مەزنە بۆ ژیانمان، ئەو دامەزرێنە بەتوانایە بۆ جیهانەکەمان و بوونەوەرەکەمان؟ لە چ شکڵێکدا دەبوو ئەو داهێنانە مرۆڤیە گرنگە بۆ پەیوەندی لەگەڵ خوادا لە ڕووی هۆکارەکانی پەیوەندییەوە؟ زۆر خۆتان بە بیرکردنەوە بەم بابەتەوە ماندوو مەکەن، خەڵکی تر ئەم هەوڵەیان داوە.

ئەگەر لە تەورات و ئینجیلدا بگەڕێیت بەو شێوەیەی کە ئێستا لەبەردەستماندان بەدرێژی بە هیچ شێوەیەك شێوازی نوێژی پێغەمبەر موسا و پێغەمبەر عیسا

(سەلامی خودا لەسەر هەردووکیان بێت) نابینیت، بەوشێوەیەی کە شوێنکەوتووانی بتوانن وەك ئەوان نوێژ ئەنجام بدەن، بۆیە شتێکی بەدیهیە کە شوێنکەوتووانیان بەناچاری شێوازیکی خۆیان داهێناوە بۆ نوێژکردن بەم شێوەیەی کە ئەمڕۆ ئەنجامی دەدەن و لە باووباپیریانەوە بۆیان ماوەتەوە.

بەڵام بابزانین نوێژخوێنانیان چییان لە دەستچووە، کە بەم شێوەیە نوێژ دەکەن؟ بێگومان ئەوەیان لە قیس چووە لە کاتی نوێژکردندا هەرگیز هەست بەو تام و چێژە خۆش و ناوازەیە ناکەن کە نوێژخوێنی موسڵمان هەستی پێدەکات، لەڕاستیدا ئەم تام و چێژە هیچ شتێك پێی ناگاتەوە، ئەویش تام و چێژی هەستکردنە بەوەی کە موسوڵمان نوێژێك ئەنجام دەدات کە پێغەمبەرەکەی راستەوخۆ لە خودای گەورەوە وەری گرتووە.

نە لە تەورات و نە لە ئینجیلدا وەصفی ئەو نوێژە نەهاتووە کە ئەم دوو پێغەمبەرە ئەنجامیان داوە، بەشێوەیەك کە شوێنکەوتووانیان بتوانن وەك ئەوان بکەن و پشتی پێببەستن لە نوێژەکانیاندا، بۆ نموونە هەموو ئەوەی کە هاتووە لە ئینجیلدا سەبارەت بە چۆنیەتی نوێژ ئەوەیە کە یەکێك لە قوتابیەکانی مەسیح (سەلامی خودای لەسەر) بە مەسیحی وت: فێرمان بکە نوێژ بکەین وەك چۆن (یوحەننا– المعمدان–) خوێنکارەکانی خۆی فێری نوێژکردن دەکرد، یەسوع پێی وتن: "هەرکاتێك نوێژتان کرد بڵێن... ".. دوعایەکی پێوتن کە لە نزیکەی (٣٥) وشە پێکهاتووە (بەپێی ئینجیلی لۆقا و بەپێی ئینجیلی مەتتا، دوعاکە لە (٤٢) وشە پێکهاتووە). {ئینجیلی مەتتا: ٦: ٩–١٣، ئینجیلی لۆقا: ١١: ٢–٤}.

هەروەها رۆژووەکانیشیان بەم شێوەیەیە، بۆیە هەر تاقمەی چەند مەرج و یاسا و رێسا و ئەو شتانەی کە دروستن بۆ رۆژووەوان ئەوانەی دروست نین و کاتی رۆژوو و رێژەکەی.. پێشنیاز دەکات کە بەردەوام ئەمانە لە گۆڕاندان لە نێوان وڵات بۆ وڵات و زەمان بۆ زەمان.

زۆر جار هەندێك موسوڵمان دەبینین کە تووڕە دەبن و قسەی توند دەکەن لە بەرامبەر یەکتر لەسەر راجیاییان سەبارەت بە درێژەی وردەکاریەکان لە نوێژدا، بۆ نموونە: ئایا دەست بەرز بکەینەوە لە نوێژدا لەگەڵ هەموو "الله أكبر"ێکدا، یان لەگەڵ هەندێکیاندا، یان تەنها لەگەڵ "الله أكبر"ی دەسپێکی نوێژدا؟ دەستمان لەسەر کوێ بگرین لە کاتی راوەستاندا؟ راستەوخۆ لەسەر ناوك؟ یان لە سەروو ناوك؟ یان تۆزێك سەرووتر؟.. هتد. بەم شێوەیە لەسەر درێژەی وردەکاریەکانی نوێژ کە زۆر جار تووشی دەدەمێ و لێکزویر بوون و ناخۆشیان دەکات، بەڵام من بڕوام پێبکەن هەست بە دڵخۆشی دەکەم کە شێوازی نوێژکردن بەم شێوە دوورودرێژە و تەواویەوە بۆمان هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە (دروودی خودای لەسەر) باسەکەی چەند جار لە چەندین ریوایەتی دوورودرێژی جیاجیاوە لە هاوەڵانەوە بۆمان گێردراوەتەوە لە پێغەمبەری خوداوە تا دەگاتە سنووری جیاوازی لە نێوان ریوایەتەکان سەبارەت بە درێژەی ئەم بابەتە بچووك و زۆر و وردانە، بەڕاستی دەبێ بزانین کە ئەحکامەکانی تر جگە لە نوێژ لە ئاسمانەوە دابەزیوەتە سەر زەوی، بەڵام نوێژ خودای گەورە وای بۆ هەڵبژاردووە کە پێغەمبەرەکەی بەرز بکاتەوە بۆ ئاسمان و لەوێ ئەم حوکمە واجبە وەربگرێت بە نوسخە رەسەنە ئەصلییەکەی خۆیەوە و بیگێڕێتەوە بۆ سەر زەوی وەك دیارییەك بۆ موسوڵمانان.

الله.. چ دیارییەکی ناوازە و جوانە لە ئاسمانەوە وامان لێدەکات چێژ وەربگرین لەو گەنجینەیەی کە سەرچاوە و ریوایەتەکانمانی لیوالێو کردووە، هەتا ئەو سنوورەی سەری کێشاوە بۆ راجیایی لێرە و لەوێ لەسەر هەندێك لە وردەکاریەکانی؟! چ پێغەمبەرێکی دەستپاکە ئەو پێغەمبەرەی ئەم گەنجینە گەوهەردارەی بۆ گواستوینەتەوە بەتەواوی وەك چۆن وەریگرتووە لە خوداکەیەوە، بەڵێ لە خودایەکەیەوە راستەوخۆ لەوێش لە ئاسمانەوە، بەڵێ بە گرنگیەکی زۆرەوە

ویستویەتی کە ئەم وردەکاریانەی نوێژ بگوازیتەوە لە ئاسمانەوە بە هۆکارێکی گواستنەوەی سەرسوڕهێنەر و ئاسانترین هۆکار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، بەناو چینە یەکلەدوای یەکەکانی ئاسماندا لای ئەو شوێنەوە کە خودای گەورەی لێیە ! !

ئایا هەست دەکەن بە بەهای ئەوەی کە وێنەیەکی دوورودرێژی تەواوی نوێژمان لە بەردەستدا بێت بەتەواوی و بەو شێوەیەی کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) وەریگرتووە لە خواکەی خۆی شەوی میعراجکردنی بۆ ئاسمان، کە تەواوی ئاینزای موسوڵمانان لەسەر هەنگاوە پانەکانی و بەڵکو لەسەر درێژەی وردەکاریەکانیشی هەندێکجار یەك ران؟

ئایا هەست بەو جیاوازیە دەکەن لە نێوان ئەو هەستەی نوێژخوێنێك کاتێك دەرك بەوە دەکات ئەوەی کە دەیڵێتەوە لە ناو نوێژەکەیدا و پەیوەست دەبێ پێوەی لە کاتە دیاریکراوەکاندا و لە خۆئامادەکردن و ئامادەکردنی پێداویستییەکانی پێش نوێژ و ناو نوێژ و دوای نوێژ.. هەر هەمووی بە شێوەیەکی حەرفی و راستەوخۆ لە خودای گەورەوە هاتووە و گوازراوەتەوە بۆمان، بەوپەڕی وردی و ئەمانەتەوە لە لایەن پێغەمبەری دەستپاك و ئەمینەوە (دروودی خودای لەسەر)، لەگەڵ نوێژخوێنێکی تر هەر نوێژخوێنێك بێت لە جیهاندا کە هەست بکات لە کاتی نوێژکردندا تەنها پیادەی ئیجتهادی هەندێك لە مرۆڤەکان دەکات کە بۆی دانراوە، یان بۆی داهێنراوە لە لایەن چەند مرۆڤێکی وەك خۆی کە خۆیان ماندوو کردووە و ئیجتیهادیان کردووە لە دۆزینەوەی دەزگایەك، یان شێوازێکی مرۆڤانە کە بیانگەینێت بە پەرستراوەکەیان؟

ئایا هەست بە گەورەیی ئەو تام و چێژە دەکەن لەلای مرۆڤی موسوڵمان و ئەو هەست بەئارامی و ئەمینی و بڕوابەخۆبوونەی کە بۆی دروست دەبێت کاتێك هەست دەکات دەنگی دەگات بە کەسێکی تر کە لەسەر هێڵە، کاتێك هەست دەکات پەیوەندی بەستووە لەگەڵ خوادا لە ڕێی ئەو دەزگا خوداییەی کە هەڵە ناکات و

خودای گەورە دروستی کردووە و دایهێناوە و پێشکەشی کردووە کە رێنماییمان دەکات بەوەی پێمان دەڵێت: ئاوا دەستنوێژ بگرە، ئاوا روو بکەرە قیبلە و ئاوا ئامادەبە بۆ نوێژ و ئاوا دەست پێبکە و ئاوا بیلێرەوە و ئاوا بجولێ و ئاوا سەلام بدەرەوە و تەواو بە..؟ زیاتر لەمانە، ئایا هەست بە گرنگی بوونی "فەرموودەکان" دەکەن لە ئیسلامدا کە بەتەواوی باسی هەموو ژیانمانی داگرتووە لە رێی باسکردنی هەموو شتێکی پەیوەست بە ژیانی پێغەمبەرەوە؟ بەهای "فەرموودەکان" نازانن تەنها ئەو کەسانە نەبێ کە هەست بە مەحرومبوونی ئوممەتانی تر بێجگە لە موسوڵمانان دەکەن لە وتە و هەڵسوکەوتی پێغەمبەرەکانیان بەو شێوە رێك و راست و رەوانەی کە لە ئاینی ئیسلامدا هەیە، بەڕاستی من زۆر سەرم سوڕماوە، زۆر بەزەییم بەو کەسانەدا دێتەوە کە باس لە پێویست نەبوونی فەرموودە دەکەن و کاریگەر بوون بەو ئاینانەی ترەوە بەبێ ئەوەی بە خۆیان بزانن و دەڵێن موسوڵمان بێنیازە لە فەرموودەکان و تەنها قورئانی بەسە!

چ گەنجینە و تایبەتمەندییەکە، چ چەترێکی ئارام و رێگەیەکی رەوان و ئەمین و روونە دەیانەوی ئیسلامی لێدابڕنن؟! وەك ئەوە بڵێی خودای گەورە هیچ باسی فەرموودەی نەکردووە، چەندین ئایەتی لەسەر نەناردۆتە خوارەوە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا، هانی نەداوین و زۆری لێنەکردووین کە شوێنی بکەوین و دەستی پێوە بگرین و شوێنی خاوەنەکەی بکەوین (درودی خودای لەسەر).

ئەوەتا خودای گەورە پێمان دەفەرموێ: ﴿وَمَا آتاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾ {الحشر: ٧}. واتە: (ئەوەی پێغەمبەری خودا پێی بەخشیون و بۆی هێناون وەری بگرن، وە هەر فەرمانێکی پێدان بەگوێی بکەن، قەدەغەی هەر شتێکی لێکردن مەیکەن).

- ﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ {المائدة: ٩٢}. واتە: (گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەری خودا بکەن).

ـ ﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾ {النساء: ٨٠}. واته: (ئەوەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکات ئەوە گوێڕایەڵی خودای کردووە).

هەروەها پەیوەستبوونمان بە فەرموودەوە پشتڕاست دەکاتەوە و بە "پێشەنگی جوان – أسوة حسنة" ناوی دەبات:

ـ ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ {الأحزاب: ٢١}. واتە: (بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو و ڕێکتان هەیە تا شوێنی بکەون).

لێرەوە گرنگیی ڕۆڵی فەرموودە دێتە مەیدان، لێرەوە گرنگیی نوێژەکانمان بۆ روون دەبێتەوە، گرنگیی ئەنجامدانیان بەتەواوی وردەکاری و دەق و ناوەڕۆکەکەیەوە، بەڕاستی ئەو نوێژە نوسخەی ڕەسەن– أصلی بەرنامەی خودایی تەواو و چڕوپڕە، خاوەن کاریگەری خێرایە لە ماوەیەکی کورت و کەمدا، بۆ ئەوەی رۆژانە پێنج جار بەرنامەکانمان دووبارە دابەزێنینەوە بۆ دەروونمان، بەڕاستی ئەم دووبارەبوونەوەیە بەسە بۆ سڕینەوەی هەر ڤایرۆسێك کە بدات لە کۆمپیوتەری ژیانمان لە کاتژمێرەکانی شەو یان رۆژدا، ئەم پێنج نوێژە دیوارێکی پارێزەرمان بۆ بنیات دەنێ ڕێگری دەکات لە ڤایرۆسی لاڕێبون کە بەردەوام کار دەکات بۆ لادانمان لەسەر ڕێگەی فیترەتی خودایی، لەهەمانکاتدا هەڵدەستێت بە کوژاندنەوەی ئاگری دارستانی تاوانەکان و خەم و خەفەتەکانمان کە گڕی تێبەربووە لە هەموو لایەکی ژیانی دنیاییمانەوە. لەلایەکی ترەوە وەك پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێ:

((تَحترِقون تَحترِقون، فَإذا صَلَّيتُم الصُّبحَ غَسلَتها، ثُمَّ تَحترِقون تَحترِقون، فإذا صَلَّيتُم الظُهرَ غَسلَتْها، ثُمَّ تَحترِقون تَحْتَرِقون، فإذا صَلَّيتُم العَصرَ غَسلَتْها، ثُمَّ تَحتَرِقون تَحْتَرِقون فإذا صَلَّيتُم المَغْرِبَ غَسلَتْها، ثُمَّ تَحترِقون تَحْتَرِقون، فإذا صَلَّيتُم العِشاءَ غَسلَتْها، ثُمَّ تَنامُونَ فَلا يُكتَبُ عَلَيْكُم حَتى تَستَيقِضوا)) *{صححه الألباني في صحيح الترغيب عن عبد الله بن مسعود}*.

واتە: (ئێوە – بەهۆی تاوانەکانتانەوە – دەسووتێن دەسووتێن کاتێك کە نوێژی بەیانیتان ئەنجامدا نوێژەکەتان دەتانشواتەوە، پاشان دەسووتێن دەسووتێن ئەگەر نوێژی نیوەڕۆتان کرد، ئەوە نوێژەکەتان دەتانشواتەوە، پاشان دەسووتێن دەسووتێن کە نوێژی عەسرتان ئەنجامدا، ئەوە نوێژەکەتان دەتانشواتەوە، پاشان دەسووتێن دەسووتێن ئەگەر نوێژی مەغریبتان ئەنجامدا، ئەوە نوێژەکەتان دەتانشواتەوە، پاشان دەسووتێن دەسووتێن تا نوێژی خەوتنان ئەنجام دەدەن، کە ئەنجامتاندا ئەوە نوێژەکەتان دەتانشواتەوە، پاشان دەخەون و هیچ گوناهێکتان لەسەر ناونووسرێت).

خانمە دکتۆرێکی یابانی گەنج لێی پرسیم: راستە دەڵێن موسوڵمانان هەموو رۆژێ پێنج جار نوێژ دەکەن؟ وەڵامم دایەوە: بەڵێ. بەسەرسوڕمانییەکی رەخنە ئامێزەوە وتی: چۆن دەتوانن ئەمە بکەن، زۆر نییە؟!، پێموت تۆ دکتۆری، رۆژانە کاتێك نەخۆشەکان دەبینی رۆژی چەند جار دەستت دەشۆی؟ وتی: سی.. تا پەنجا جار..، سەیری کردم و لە چاوەکانیدا وام خوێندەوە کە لە پرسیارەکەی منەوە جوابی دەست کەوت پێش ئەوەی بۆی روون بکەمەوە.

ئەوەتا پێغەمبەر دەفەرموێ: ((قُمْ فَصلِّ فإنّ الصَّلاةَ شفاءٌ)) *{رواه ابن ماجة عن أبي مريرة}*. واتە: (هەستە نوێژەکەت بکە، چونکە نوێژ شیفایە).

ژیان لە چواردەورمان پڕیەتی لە ڤایرۆس، پڕیەتی لە هەڵخەڵەتێنەرەکان، لە هاندان لەسەر خراپە و لە خشتەبردن، پڕیەتی لە لادان و لاوازی مرۆڤ و پاڵنەرە شەیتانیەکان، پاککەرەوەی هەموو ئەمانەش بە ئاو نیە، بەڵکو بە نوێژە، ئاوەکە دیوی دەرەوەمان پاك دەکاتەوە، نوێژیش هۆکارێکە بۆ پاککردنەوەی دیوی ناوەوەمان.

کاتێك نوێژکەر هەستی کرد لە دوای نوێژکردن هیچ گۆڕانکارییەك بەسەر دڵ و دەروونیدا نەهاتووە، چۆن چۆتە ناو نوێژەکەوە ئاوا هاتۆتە دەر، هەستی نەکرد

بەوەی کە شتێك لە دڵ و دەروونیدا گۆڕاوە، یان نەجاتی بووە لەو گوناه و خاشاکەی پێوەی نوساوە، یان هەستی نەکرد بەوەی کە وەك ئەوە وایە کە تازە لەدایك بووبێت، ئەمە مانای وایە لەو نوێژەیدا بەڕێکوپێکی ئەو سیدیەی بەکارنەهێناوە کە بەرنامەکانی بۆ دادەبەزێنێتەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە ڤایرۆسەکان تا ئێستاش قوڵایی دەروونی فایرۆساوی دەکەن، ئێستا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە سەری بووە لە لاوازی و لادان و پاڵنەرە شەیتانیەکان.

ئەگەر بەراورد لە نێوان مرۆڤی نوێژکەر و مرۆڤی نوێژنەکەر بکەین، ئەوە بەزەییمان بە مرۆڤی دووەمدا دێتەوە، بەوەی کە ئەم چەکە گرنگەی نییە کە پشتی پێببەستێت لە هەموو کارێکی گرنگ، یان رووداوێك، یان موسیبەتێك، کە تووشی دەبێت، کە چەند زۆریش بن ئەو بەڵاو موصیبەتانە، سەرمان سوڕدەمێنێت لە نوێژکەر، نوێژکەری راستەقینە، لە حاڵەتی دەموچاوی، کە هەردەم پرشنگدارە، چەندە رێگەکانی لێ تاریك بن، سەرسام دەبین لە چاوە لێبوردەکانی، کە هەردەم راهاتوون لەسەر میهرەبانی و ملکەچی و نەرمونیانی، هەرچەندە ناڕەحەتی و ناسۆرەکانی توند و زۆر بن، تەنانەت کە دەڕوانیتە دەموچاوەکانی چواردەور، زۆر جار نوێژکەر و نوێژنەکەر لێك جیا دەکەیتەوە، وەك بڵێی ئەو میهرەبانییەی کە چاوەکانی نوێژخوێنان پڕ دەکات بە بەردەوامی ئەوە بێت کە ئایەتە پیرۆزەکەی سورەتی {الفتح} ئاماژەی پێداوە کاتێك باسی سیما و دەموچاوی نوێژخوێنان دەکات و دەفەرموێ: ﴿تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾ {الفتح: ٢٩}. واتە: (دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین کڕنووش و سوژدە دەبەن، هەردەم ئاواتیان بەدەستهێنانی رەزامەندی و پایە بەرزییە لەلای خودا نیشانەی چاکی و پاکیان لەناوچاوانیاندا دەدرەوشێتەوە لە ئەنجامی سوژدەبردن و خواپەرستنیان).

سوێند بەخوا ئەوەیە کە دەناسرێتەوە، نەك ئەو پەڵە رەشەی کە لە ناوچەوانی

هەندێك خەڵكدا دەبینرێت، كە هەندێك وا حەزدەكات وا بخوێنرێتەوە كە ئەو پەڵەیەی دەموچاوی سیمای نوێژ و سوژدەیە، ئەگەر ئەوە مەبەست بوایە ئەوە ئایەتەكە دەیفەرموو (سیماهم في جباههم)، نەخێر ئەو ئاكار و نیشانەی دەموچاوانەن كە پرشنگدارن، ئەو دەموچاو و ئاكارە بەخشندە و میهرەبانەن كە تەنها نوێژخوێنان پێی بەهرەمەند دەبن، فیراسەتی مرۆڤی موسوڵمان هەڵە ناكات لە خوێندنەوەیدا، لە دەموچاوی نوێژخوێناندا.

هەموو پەرستشەكانی كە فەرمانمان پێكراوە تەنها ئامانج لێی دووبارە دابەزاندنەوەی بەرنامەكانە، چەندە جیاوازی ببێ لەنێوان كات و شوێنەكانی.

بە نموونە رۆژوو بەرنامەیەكی كاریگەر و دوورودرێژە، كە لە كۆمپیوتەری ناخ و و دڵ و دەروونماندا دادەبەزێت، پێویستی بە یەك مانگ هەیە تا بەتەواوی دادەبەزێت، بەڵام كاریگەریەكەی تا ساڵێك دەمێنێت، ئێمە بە دابەزاندنی بەرنامەی رۆژوو، بەرنامەكانی شەهوەت و ئارەزووەكانمان جارێكی تر رێك دەخەینەوە، كە باریان قورس بوو بە ڤایرۆسی زۆر بەدرێژایی یەك ساڵی پێشوو، بەرنامەی چاوەكانمان دادەنێینەوە كە گومان نییە لاوازی مرۆڤ لەبەرامبەر هەڵخەڵەتێنەرە شەیتانییەكان بەدرێژایی كات لاوازی كردووە، جارێكی تر بەرنامەی زمانمان دادەرێژینەوە كە بەهۆی تێپەڕبوونی كات و مانگەكانەوە راست و هەڵە و حەرام و حەڵاڵ و پیس و پاك و حەق و بەتاڵی لێتێكەڵ بووە، هەروەها جارێكی تر بەرنامەی ناخ و دەروونمان دادەنێینەوە كە لەماوەی ئەم ساڵەدا چەندەها چڵك و پۆخڵیی شەیتانی پێوە نووساوە، كە خەریكە تۆوی رەحمەت و بەزەیی و حەق و دادپەروەری و گومانی باش و رازیبوون و قەناعەت و ملكەچی و ئارامگرتن و چاكە و سوپاسگوزاری و چێژی ئیمان و گوفتاری جوانمان تێدا بكوژێت.

هەروەك رۆژوو فەریزەتی "حەج"، بەڵام بەرنامەیەك بۆ ماوەیەكی درێژتر و كاریگەری قوڵتر، چونكە حەجی خێر ئامێز و قەبووڵكراو وەك پێغەمبەر (درودی

خودای لەسەر) دەفەرموێت: ((لَیسَ لَهُ جَزاءٌ إلاّ الجَنَّة)). واتە: (هیچ پاداشتێکی نییە تەنها بەهەشت نەبێت)، هەرکەسێك کە خودای گەورە حەجەکەی لیٚ قەبولٚ بکات وەك ئەو ڕۆژەی لێدێتەوە کە لە دایکی بووە وەك پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) بەڵێنی پێداوین.

بڕوانە کاتەکانی نوێژ، وردە وردە لەیەکتر نزیك دەبنەوە لەگەڵ هێرشە شەیتانیەکان بۆ سەرت، سەرەتا نوێژی بەیانی ئەنجام دەدەیت، پاشان نزیکەی نیوەی ڕۆژەکە دەوەستی تا نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام دەدەیت، بەڵام مۆڵەتی نوێژی دوایی کەم دەبێتەوە، چونکە نوێژی دوایی لە ڕۆژدا لە ناوەڕاستەکەیدا نوێژی عەسر هەیە، پێش ئەوەی کۆتایی بە ڕۆژ بێنین، پاش رۆژ ئاوابوون نوێژی شێوان هەیە، پاشان کاتێکی کەم دەوەستین نوێژی خەوتنان دێت و پاشان بەرەو خەوتن دەڕۆین.

ئا ئەمەیە تایبەتمەندی نوێژ، ئەمە هەندێکە لە نهێنیەکانی لێکنزیکبوونەوەی کاتەکانی لەیەکتر و دووبارەبوونەوەی ڕۆژانە پێنج جار، لە چ جۆرە تاقیگەیەکی چەك دروستکردنی پێشکەوتوو و وردەکاردا چەکێکی ئاوا دەبینین کە کاریگەرتر و وردەکارتر بێت لە پێکانی ئامانجدا و بەدڵنیاییەوە ئامانجەکانی بپێکێت و سەرکەوتن بۆ خاوەنەکەی مسۆگەر بکات و ئامانجە چاوەڕوانکراوەکانی بهێنێتە دی، لە چەکی نوێژکردن باشتر بێت.

# ریتمی نوێژ و ریتمی ژیان

لــە زســتاندا مــرۆڤ بــەدوای گەرمکــەرەوەدا دەگــەڕێت، لــە هاوینیشــدا بــەدوا فێنککەرەوەدا، لە نەخۆشییدا بـەدوا دەرمـان و لـە برسـێتیدا بـەدوای خـۆراك و لـە تینوویێتیدا بەدوای ئاو و لە قەڵەباڵخی و دەنگەدەنگدا بەدوای شـوێنێکی بێـدەنگ و لە کاتی ترسدا بەدوای شوێنی ئەمین و بێ ترسدا دەگەڕێت.

ئەگەر رەوڕەوەی ژیان بـەخێرایی بـڕوات، کـە لـەم چـەرخەدا لـە هـەموو کاتێـك خێراترە کە چەرخی ئەلیکترۆنی و تەکنەلۆژی گەیەنەرە بۆ هەموو کایەکانی ژیـان، کەواتە دەبێت نوێژەکانمان ئارامگایەك بێت بۆمان و بمانپارێزێـت لـە رەوڕەوەکـەی کە بە دانە ئاسـنینە رەقـەکانی تێکمـان بشـکێنێت، کـارێکی ئاسـاییە کـە رەوڕەوە پێچەوانەییەکەی نوێژ کە پێمان دەبەخشێت لـەو بـەهێزتر بێـت لـە رووی ئـارامی و ئیسراحەت و تەسلیمبوونەوە.

هیچ کات بیرتان لەوە کردۆتە کە ریتمی نوێژ هاوشانبێت لەگەڵ ریتمی  ژیاندا بە شێوە خێراکەی، یـاخود رەنگـە بڵـێم شـێتەکەی؟ وەك هـەموو کـارێکی تـری ژیـان مامەڵەی لەگەڵ بکەین، ئەگەر وابێت ئەوە نوێژ دەبێتە بـارێکی قورسـی تـر لـەبارە قورسەکانی ژیان وەك لای هەندێك کەس بەم شێوەیەیە، بـاری سەرشـانمان قـورس دەکات بەهۆی ئەوەی کـە کۆشـش و کـات و هەسـت و بیرکردنـەوەی  زیـاتر بـەکار دەبەین وەك ئەنجامدانی هەرکارێکی میکـانیکی رۆژانـەی تـر، بۆیـە هـەوڵ دەدەیـن وەك کاروبارەکانی ژیان خێرا لەکۆڵ خۆمانی بکەینەوە، بەتەواوی وەك چۆن مامەڵە لەگـەڵ بابەتــە میکانیکیــەکانی ژیــان دەکــەین کــە هــیچ لایــەنێکی رۆحــی تێــدا بەکارناهێنین، بەڵکو رەنگە لە روانگەی ئەم دەرەنجامە نادڵخۆشکەر و ناهاندەرەوە هەوڵ بدەین ئەم ئەرکە میکانیکیە لە ژیانماندا بسڕینەوە بەتەواوی، چـونکە جێگـە نیە لە ژیانی رۆژانەماندا لـەوە زیـاتر بـۆ ئـەم جـۆرە ئەرکـە میکانیکیـە قەڵـەباڵغ و مادییانە.

بزانە زیادکردنی ئـەم ئەرکـە — نوێـژکردن— ئاسـان نییـە لـە سـەرەتاوە، چـۆن دەتوانین پەلە نەکەین و کارێك زیاد بکەین کە هەزار کار و ئـەرك و بەرپرسـیارێتی و وادە و بەرنامە و کۆبوونەوە و سەردان و پێشـوازی و خوێنـدن و بڕیـار چـاوەڕێمان دەکات لەبەر دەرگا؟!

ئەگەر بیرکرنەوەمان سەبارەت بە نوێژ بەم شێوەیە بێت لەکاتێکدا کـە خۆمـان ئامادە دەکـەین بـۆ فـڕین بـۆ بۆشـایی نوێـژ، ئـەوە هـەرگیز نـاتوانین بـە کەشـتیی نوێژەکانمان لە توێکڵی بۆشایی ئاسمان دەربچین، کەشتیەکەمان دەسووتێت پێش ئەوەی بفڕین:

ـ پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) فەرمووی بەو کەسەی کە نوێژەکەی بەپەلە و بێئاگایی ئەنجامـدا: ((ارجِـعْ فَصَـلِّ فإنَّـكَ لَـمْ تُصَـلِّ)) *{رواه البخـاري عـن أبـي هريرة}*. واتە: (بڕۆ جارێکی تر نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکردووە).

هەر لەسەر ئەو بنەمایەیە نوێژەکانی ڕۆژ بە دەنگی نزم ئەنجام دەدرێن کە گونجاوە لەگەڵ نەغمە و بەرزیی ریتمەکانی ژیان کە لەو کاتەدا پڕە لە دەنگەدەنگ و قەڵەباڵخی، بەرزبوونەوەی دەنگی  مرۆڤەکان، بەرزیی پلەی گەرما و تیشکەکەی، بەرزیی ترپەی جموجۆڵی چواردەورمان، زیادبوونی کارکردن و چالاکی و ڕۆیشتن بەرەو کاسبی و لایەنی ماددیی زۆر و خێرا و ئاڵۆز.

بەڵام نوێژی ئێوارە ئاساییە بەپێچەوانە کە گونجاو بێت لەگەڵ بێدەنگیی شەو و ئارامیی و پەنهانیی و تاریکییەکەی، لەگەڵ کەمبوونەوەی جووڵەی کارکردن بۆ پەیداکردنی ڕۆزیی و راوەستانی ئاشی ژیان لە دەنگەدەنگ و جولانەوە، بۆیە خوێندنی نوێژەکانمان بەدەنگی بەرز کەمێك لەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە، بۆئەوەی هاوسەنگیی بۆ دەفری دەروونمان بگێڕێتەوە، لەناخماندا پارێزگاری لە هاوکێشەی ریتم و ترپەی ژیان بکات، پاشان شێوەی دەنگ و رەنگ و جوڵەکانمان بۆ ڕێکبخات و هاوسەنگیی دەروونیمان بۆ بێنێتە کایەوە کە خەریك دەبێ لەدەستی بدەین.

رۆژەکانمان کۆتایی پێدەهێنین بە نوێژی خەوتنان، لێرەدا دوورودرێژیی و جیاوانی جۆریی بەدی دەکەین، ئێستا چوار رکاتی درێژمان لەبەردەمدایە، دوانیان بە دەنگی بەرز دەخوێنین بەپێچەوانەی بێدەنگی شەو و ئارامیەکەی، وەك ئەوەی رۆژ گەڕابێتەوە بۆ ئەوەی بۆشاییەکی پێویستت بخاتە بەردەم کە دەتوانی بە دەنگت پڕی بکەیت و هاوار بەریت پێی بۆ لای خودا، پاشان دوو رکات نوێژی سوننەتی دوای عیشا ئەنجام بدەیت و پاشان رکاتێك یان چەند رکاتێکی ویتر بکەیت، دەتوانی ئەم رکاتە ویترانە یەك یان سیان یان پێنج یان زیاتر بەتاکی ئەنجام بدەی، ئەو فراوانی و دەستکراوەییە لە زۆریك لە پەرستشەکانی تردا هەن وەك لەمەودوا ئاماژەی پێدەکەین، ئەمەش رێگەپێدانێکی نەرم و فراوانە بۆ درێژکردنەوەی نوێژ، درێژکردنەوەیەك کە هەست بکەی بە قەبارەی ئەو هەموو چڵکە کەڵەکەبووەی رۆژ کە کۆبۆتەوە بەسەرتدا، بە هۆیەوە کە ناترسیت زیاد بکات و هێرشت بکاتە سەر و هەڵتبخەڵەتێنێت لە ڕێی پاڵنەرە شەیتانیەکانی شەوەوە.

تێبینی بکە و ببینە سوننەتەکان لە پێش و دوای نوێژەکانماندا زۆر دەبن کاتێك کە رکاتی فەرزەکان زۆر بوون، هەروەها کەم دەبنەوە کاتێك کە ئەوان کەم دەبنەوە، ئەمە هەندێك لەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە پێویستە ژمارەی رکات و نوێژەکانمان بگونجێت لەگەڵ حاڵەتەکانی ژیانمان، لەگەڵ بەرزبوونەوەی پێویستیمان بە پەیوەندیبەستن هەیە بە خودای گەورەوە لە رۆژدا یان لە شەودا یان لە کاتی کێشەکاندا.

## جۆراوجۆری: قوتابخانەی شارستانی یەکەم

هیچ کاتێك بووە پرسیارتان کردبێت وەك من پرسیارم کرد جارێکیان: بۆچی نوێژەکانی ئێمە بەم شێوە جیاواز و جۆراوجۆرەیە لە رووی ژمارەی رکات و هەستان و دانیشتن و جوڵەکان و خوێندنەوەکان و کاتەکان و ناوەکان و جۆرەکان؟ بۆ لەسەر یەك شێوە و یەك رەنگ نەبوون وەك نوێژی هەندێك لە ئاینەکانی تر؟ بۆ ئەم جۆراوجۆری و " ئالۆزی" و "قورسی" و "شلەژان"ە، بۆچی ئەم هەموو جۆراوجۆریە لەنێوان نوێژەکانی بەیانی و نیوەڕۆ و عەسر و شێوان و خەوتنان؟ بۆچی ئەم هەموو جیاوازیە لەنێوان فەرزەکان و سوننەتەکان و نوێژی ویتر؟ لەنێوان سوننەتەکانی پێش نوێژ و دوای نوێژ؟ سوننەتە جەخت لەسەرکراوەکان و جەخت لەسەرنەکراوەکان؟ شەوانەییەکان و رۆژانەییەکان؟ ئەوانەی بە بێدەنگی دەیانکەین و ئەوانەی بەدەنگی بەرز دەیانکەین؟ ئەوانەی بەتەنها دەیانکەین و ئەوانەی کە بە جەماعەت ئەنجامیان دەدەین؟ بەڕاستی بەم شێوەیە وا دەردەکەوێت کە نوێژ وانەیەکی خوێندنی قورسە، لە ئاستێکی بەرزدایە، نوێژخوێن دەبێت فێری ببێت و ئەنجامی بدات بەتەواوی هەتا بزانێت چۆن نوێژەکانی ئەنجام دەدات، باشە بەم شێوەیە کارگرانی نییە لەسەر منداڵ و ناکامەکان و نەخوێندەوارەکان و جاهیلەکان؟ ئەی باشە چۆن ئاوایە و کەچی ئیسلام لە ناو گەلێکدا هاتووە کە نەخوێندەوار بوون و نەیانتوانیوە بنووسن و بخوێننەوە.

بەڕاستی عەقڵە کورتبینەکانی ئێمە دەرك ناکات بە کاربەجێییە خودایيە گەورەکان، لەکاتێکدا هەوڵ دەدات بگەڕێت بەدوای وەڵام بۆ ئەم پرسیارانە، بەڵام ئێمە کە وەصفدارکراوین بەوەی کە موسوڵمانین فەرمانمان پێکراوە کە بیربکەینەوە و عەقڵمان بخەینەگەڕ و وردببینەوە لە کارە بەجێیەکان و ئامانجەکانی خودای گەورە و ئەوەی کە بۆ ئێمەی ویستووە و فەراهەمی هێناوە، تا هەوڵ بدەین بگەین بە هەندێکیان ئەگەر هەمووشیان دەرك نەکەین.

خۆمان و جیهانیش چەندە پرسیارمان بۆ دروست بووە کە ئایا ئیسلام چۆن توانی عەرەب بەو خێراییە قیاسیە کە خێرایی شۆڕشی کۆمپیتەری ئەمڕۆی تێپەڕاندووە، لە گەلێکەوە کە پێویستیان بەوە بوو خەڵکانێك نامەیان بۆ بخوێنێتەوە، ئەو کات ئەگەر نامەیەکیان بۆ نووسرابا پێویستبوو یەکێك سەفەر بکات بۆ شوێنێکی وا کە خوێندەوارێکی تێدا بێت تا نامەکەیان بۆ بخوێنێتەوە و لە ناوەڕۆکەکەی بگەن، تا وایان لێهات لە ماوەی دوو دەیە، یان سێ دەیەدا بناغەی هەندێ زانست دانێن وەك زانستەکانی زمانەوانی و نەحوو و صەرف و فەرهەنگ و بەلاغە و نەقد و تەفسیر و قیرائات و زانستەکانی فەرمودە و فیقه و سیرە و زانستی رجال و زانستەکانی زەویناسی و مێژوو و جوگرافیا و فەلسەفە و مەنتیق و پزیشکی و فەلەکناسی و بیرکاری و ماتمایك و .. چەند دەژمێری بژمێرە.

نوێژ رۆڵێکی دیاری هەبوو لەم خێراییە سەرسامە لە لەدایکبوونی ئەو شارستانیەتە ئیسلامیەی کە مێژووی شارستانیەتەکان هاوشێوەی نەبینیوە و ناشیبینێت.

بەڕاستی ئەم جۆراوجۆریە لە هەڵسوکەوتەکانی نوێژ ئەو شتانەی کە تیایدا دەخوێنرێت و شێوازی خوێندنەکانی و کاتەکانی و شێوەکانی و ژمارەی رکاتەکانی و جۆری ئەو رکاتانە قوتابخانەی یەکەم بوون کە مێشکی منداڵی موسوڵمانی لەسەر گۆش دەبوو و پیادەی راهێنانە فیزیاییەکانی لەسەر دەکرد بۆ فراوانبونی خانەکانی مێشك و ئامادەکردنی بۆ بیرکردنەوە و لەبەرکردن و شیکاری و داهێنان، بەڕاستی نوێژ قوتابخانەیەکە کە مێشکی منداڵەکانمان فێر دەکات کە چۆن فکر و بیر و هۆشەکانیان رێك بخەن، بابەتەکانیان بڵاوبکەنەوە و رێکیان بخەن، دەرهاویشتەکانیان شیبکەنەوە و زانستەکانیان دابمەزرێنن و ئاسۆ شارستانیەکانیان دیاری بکەن.

ئایا ئیسلام بەم جۆرە فێرکردنە رێك و میکانیکیە نەیتوانی ئەم نەخوێندەوارانە

بکات بە خاوەنی شارستانیەتێکی تێر و تەواو لە رووی فیکر و رۆشنبیری و زانستەکان و خوڕەوشتەوە؟ نالێم کردنی بە خاوەنی ئیمپراتۆریەت، چونکە زۆرێك لە ئیمپراتۆریەتەکان تەنها شەڕ و خوێنڕشتن و کوشتن و کاولکاریان دەزانی، وەك مەغۆل و تەتار.

قوتابی لە وڵاتە رۆژئاواییەکان لە پێنجساڵیی دەچێتە بەر خوێندن، لە زۆرێك لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامیەکانیش لە شەش ساڵیەوە دەچێتە بەرخوێندن، بەڵام لە قوتابخانەی ئیسلامدا لە حەوت ساڵیی دەچێت و ئەوە ئەو ساڵەیە کە فەرمانمان پێکراوە منداڵەکانمان فێری نوێژ بکەین.

نوێژ بەو جۆراوجۆریە مانای ئەوەیە کە دەبێت هەموو موسوڵمانێك بچێتە قوتابخانەی زانست و بیرکردنەوە و شارستانیەت و بنیاتنان لەو تەمەنە زووەوە کە تەمەنی منداڵییە، بەتەواوی ئەو مانایەی کە قوتابخانە دەیگرێتەخۆ لە بەرپرسیارێتی و تێگەیشتن لە لەبەرکردن و خۆئامادەکردن و پلاندانان بۆ دەرچوون و سەرکەوتن و داهێنان، لەمەودوا نەخوێندەواری نیە، نەزانین نییە، لەمەودوا تەمبەڵی و لەش خاوی و پاڵدانەوە و تەسلیمبوون بە نەزانیی بۆماوە نیە، تەواو تۆ موسوڵمانیت، کەواتە تۆ فێرخوازیت، تۆ موسڵمانیت، کەواتە تۆ شارستانییت.

یەکەم وانە کە دەیخوێنیت و وەریدەگریت لە قوتابخانەی ئیسلام و بەتەواوی فێری دەبیت و دەردەچیت تیایدا، پاشان پیادەی دەکەیت، بریتیە لە وانەی نوێژ، پێویستە ژمارەکانی و کاتەکانی و ناوەکانی و جۆرەکانی و جوڵە و دەق و پابەندبوونەکانی و ئەو شتانەی دروستن و ئەوانەی قەدەغەن تیایدا.. فێر ببین، پاشان پێویستە بۆ ئەوەی موسوڵمانێکی راستەقینە بیت ناوەڕۆکی بابەتەکانی بە تەواوی فێرببیت و ئینجا پیادەی بکەیت، بەپێچەوانەی خوێندن لە هەندێك لە قوتابخانە و زانکۆکانی ئەمڕۆ کە خوێندکار خەریکە زانست و فێربوون لە زیهنیدا دەکوژێنرێتەوە و شەهادەوەرگرتن و ماندووبوونەکەی تەنها هۆکارێکە بۆ گەڕان

بەدوا کارێك یان رزقێکدا.

ئەم وانەی یەکەمە لە قوتابخانەی ئیسلام، لە تەنیشت وانەی قورئانی پیرۆز و فێربوونی خوێندنەوەی و تەجویدەکەی و دەربڕینەکەی، پاشان لەبەرکردنی هەندێك لە فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر)، ئەمانە موسوڵمانی بچووك و منداڵ بەشێوەیەکی راستەوخۆ والێدەکات کە وانەکانی تری زانستەکانی ئیسلام فێر ببێت و هەوڵی فێربوونیان بدات، تێبگات لەو بابەتانەی کە پێویستە تێیان بگات، ئەو بابەتانە لەبەربکات کە پێویستە لەبەریان بکات، ئەمە دەبێتە دەروازەیەك بۆ فێربوونی زانستەکانی تری ژیان و قوڵبوونەوە تیایدا و دۆزینەوەی نهێنیەکانی.

نوێژ بۆ موسوڵمان مانای رۆشنبیری و زانست، پاشان شارستانییە، ئەگەر وانیە باشە چۆن سەرکەوتوویی زۆربەی ئەو خوێندکارانەی کە لە ماڵێکی ئەهلی نوێژ پەروەردە دەبن بەسەر ئەو خوێندکارانەی کە نوێژکەر نین و لە ماڵێکدا پەروەردە بوون کە نوێژخوێن نین لێکدەدریتەوە. بەڵام دەبێ بزانین کە ئەم جۆراوجۆریەی نوێژ ئەرکێکی تری هەیە بێجگە لە ئەرکە شارستانیەکەی ئەویش بریتییە لە "ملکەچی– خشوع".

## گرنگی جۆراوجۆری بۆ ملکەچی و ئاگا لەخۆبوون لە نوێژدا

هەر شتێك دووبارەبوونەوە و پەیوەستبوون لەسەر یەك حاڵەت و رۆیشتنی هەنگاوەکانی بەشێوەیەکی میکانیکی بوون، ئەوە بێئاگایی زیهنیمان بۆ دروست دەکات و وامان لێدێت بەبێ ئاگا لەخۆبوون کارەکە ئەنجام بدەین، بەڵکو رەنگە بمانگەیەنێتە وەنسك و خەویش.

ئایا تێبینیت کردووە کاتێك کە سەیارە لێدەخوڕیت لە سەر ڕێگە بەرز و دورو درێژو پان و رێکەکان، چۆن تووشی وەنسك و خەواڵویی و بێتاقەتی دەبیت، رەنگە

تووشی پەرتەوازەیی مێشك و بیركردنەوەش ببیت؟ ڕێگەیەكی لێكچوو كە ناگۆڕێت، خێراییەك كە بە دەگمەن زیاد و كەم دەكات؟ بەڕاستی دوژمنی یەكەم بۆ ملكەچی و قوڵبوونەوە لەناو نوێژدا و بیركردنەوە لە ماناكان تیایدا بۆ گەیشتن لە ڕێگایانەوە بە خودای گەورە بریتیە لە تەسلیمبوون بە ئولفەت و ڕاهاتن و عادەتیبوون و سوود وەرنەگرتن بەشێوەیەكی باش لە جۆراوجۆری لەو شتانەی كە ئەم پەرستشە ڕێگەمان دەدات كە بەشێوەیەكی جۆراو جۆر ئەنجامی بدەین.

بەڕاستی ئەم جۆراوجۆریە لە ژمارەی ركاتەكانی نوێژ و جیاوازی كاتەكانی ئەم نوێژانە و جیاوازی سروشتی خوێندنەوەكان تیایاندا و جیاوازی شێوازی لەش و دانیشتنەكان، هەروەها جیاوازی ویرد و زیكرەكان بەپێی هەستان و جوڵەكان.. جگە لەمانەش زۆر جیاوازی تر كە هەندێكیانمان باس كردوون لەمەوپێش، كە دەكرێت بمانپارێزن لە گریمانەی پەرتبوون و لادانی زیهنمان لەوەی ئەنجامی دەدەین و دەیڵێین لە نوێژدا، بەهۆیەوە چەقبەستویی و عادەتیبوونمان لێ دوور بكەوێتەوە، وامان لێبكات بە ئاگاتر بین لەو شتانەی كە دەیڵێین، زیاتر هەست بە خشوع و ملكەچیی بكەین لەگەڵ خوادا لە كاتی ئەنجامدانی ئەم روكنە سەرەكیە لە ناو عیبادەتە ڕۆژانەییەكانماندا، لەگەڵ ئەوەیشدا كە ڕاهێنانێكی كرداریی زۆر باشە بۆ مێشكمان و ئامادەی دەكات بۆ وانەی زیاتری تر كە بەبەردەوامی و دەبێ لەمەودواش هەر وابمێنێت ئەو زەویە بێت كە لێیەوە دەردەچین بۆ بنیاتنانی شارستانیەتی مرۆڤایەتی.

وانەی نوێژ بەو جۆراوجۆریەی وانەیەكی سووك نییە، باشە چ كاتێك هەبووە دروستكردنی مرۆڤ كارێكی ئاسان بووبێت یان بنیاتنانی شارستانییەت كارێكی سادە و ئاسان بووبێت، چ كاتێك دروستكردنی دەوڵەت و بنیاتنانی بەبێ ئەم ڕۆحییەتە دێتەكایەوە، بەبێ ئەو هیممەتە بەرزانە جێبەجێ دەكرێت؟

باشە دەبێ بۆ ئەم جۆراوجۆریە لەم وانە گەورە سەرسوڕهێنەرەدا لە روكنی

دووەمی ئیسلامدا خودای گەورە پێغەمبەری خودای (درودی خودای لەسەر) بانگ کردبێت بۆ (سدرة المنتهی) بۆ ئەوەی ئەم وانە قورس و درێژەی لە وانەکانی ئیسلامی پێ بڵێت، جیاواز لە وانەکانی تری جیبریل کە بەشێوەیەکی جیاواز بە پێغەمبەری خودا وتراون.

بەڕاستی جۆراوجۆریی قوتابخانەیەکە بۆ نەرمی و قبوڵکردنی بەرامبەر، بەڕاستی پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر) چەند وانەیەکی وای پێ وتووین لە نەرمونیانی و جۆراوجۆریدا کە لەبیر ناکرێن جا لە نوێژەکاندا بێت یان لە پەرستشەکانی تردا، بەتایبەت لە سوننەتەکاندا، ئەم نەرمونیانیە لەڕاستیدا نوێنەرایەتی رۆحی ئیسلام دەکات، ئیسلامێکی لێبوردە و میانڕەو و گونجاو لەگەڵ زەمانە و کەشەکان و زروفەکاندا، کە دەکرێت جۆراوجۆر و جیاواز بێت لە لای هەریەکەمان.

## گۆڕانکاری لە شێواز و جوڵەکان.. بۆچی؟

گۆڕانکاری لە شێوەی لاشە لە نوێژدا و جۆراوجۆریەکانی بە ئەنقەست بێ هۆ ئاوا دانەنراوە، ئەگەر وابوایە ئەوە دەمانتوانی هەرشتێك حەزمان لێیبوایە بمانوتایە و بمانخوێندایە، بەدانیشتنەوە یان بەپێوە، یان بەراکشانەوە، لەسەر لا یان لەسەر پشت، یان بەبێ هیچ جوڵەیەك وەك نوێژی نەخۆش.

جگە لە رۆڵی جموجوڵەکانی نوێژ کە جۆراوجۆریمان بۆ فەراهەم دێنێن و بەدورمان دەگرن لە ترسی دوبارەبوونەوە و راهاتن و خەیاڵڕۆشتن و پەرتبوون، بۆمان هەیە پرسیار بکەین: بۆچی خوێندنەوەکان لەناو نوێژدا پەیوەستکراون بە گۆڕانکارییەکانی لاشەوە، هەر جووڵەیەك و گۆڕانێکی لاشە جۆرە خوێندنەوە و زیکرێکی بۆ دانراوە؟ بۆ نموونە بۆچی زیکری (سبحان ربي العظيم) لە چوونە رکوعدایە و لە سوجدەکاندا نییە و لەوێدا (سبحان ربي الأعلى) دەخوێنرێت؟ بۆچی

خوێندنەوەی دەقە قورئانیەکان تایبەت کراوە بە کاتی راوەستانەکان بەپێوە، لەکاتی دانیشتندا دەقی فەرموودەیی (التحیات والصلوات ..) دەخوێنرێت؟ بۆچی..؟ بۆچی..؟ چەندین پرسیاری لەو جۆرەی تر.

بەڕاستی گۆڕانکاری لە حاڵەتەکانی نوێژدا دەکرێت یارمەتیدەربێت لەسەر زیندووی و تووندوتۆڵی بەئاگا لەخۆبونێکی تەواوەوە بەرامبەر ئەو کەسەی کە روومانتێکردووە و دەسمانکردووە بە قسەکردن لەگەڵیدا، وەك بڵێی بەم جموجۆڵ و گۆڕانکارییانە لەگەڵ خوێندنەوەی زیکرەکاندا راهێنان بێت لەسەر تێگەیشتن و حاڵیبوون لەسەر ئەوەی کە دەیخوێنینەوە، بۆ ئەوەی راستەوخۆ لاشەمان جموجوڵەکانمان و ئەو بابەتانە جێبەجێ بکات کە بە دەم و زمانماندا دێت، ئەوە وەك ئەوەیە کە جەختکردنەوە بێت لەسەر پەیوەستبوونی گوفتار و کردارەکانمان بەیەکەوە، باوەڕبوون و دڵنیابوون بێت بەوەی کە دەیلێین.

بە چاوپۆشین لە تێگەیشتنمان لەم گۆڕانکاری و جموجوڵ و حاڵەتانەی ناو نوێژ و ئامانج و فەلسەفەکانی، چەندە ئەم بیرو بۆچوون و تێگەیشنانەمان بێنەوە لەگەڵ ئامانجی خودایی بۆ تەشریعکردنی نوێژ بەم شێوەیە، دەتوانین بڵێین گرنگترین سوود لەم جۆراوجۆری و هەستان و دانیشتنانەی نوێژ ئەوەیە کە بەم شێوەیە پارێزگاری دەکەین هاوتابوونی هێڵی جوڵەکان لەگەڵ هێڵی وشەکان و گوفتارەکان و بەیەکەوە دەربڕین، جوڵەکان دەگونجێنین، ئەمە کارێکی گرنگە و بابەتێکی سەرەکیە لەسەر بەڵگەهێنانەوەمان بۆ راستی و دروستی و ئیخلاصمان لە رووتێکردنی ئەو کەسەی کە قسەی لەگەڵ دەکەین، وەك لەمەودوا تیشکی دەخەینەسەر.

تەنها جموجوڵەکانمان نییە لە نوێژدا کە دەکرێت سەرنجی خەڵکمان بۆ لا رابکێشێت، بەڵکو راوەستانیش – سکون– لە جوڵەکانیشماندا جێگەی تێڕامانە. بەڕاستی پەیوەستبوونە تەواوەکانمان رووبەڕووی قیبلە بەدرێژایی نوێژ و پارێزگاری

بەردەوامامان لەسەر تەنها سەیرکردنی شوێنی سوژدەبردن، خۆڕاگرتنی تەواومان لەسەر ئاوڕنەدانەوە بەلای راست و چەپدا لەبەر هەر هۆکارێك بێت و وەڵامنەدانەوە و قسەنەکردن لەگەڵ هیچ کەسێکدا، بەڵکو دابڕینی جێگەیەکی تایبەت بە نوێژەکانمان لەنێوان ئێمە و قیبلەدا و دانانی بە شوێنێکی قەدەغە و رێگەنەدانمان بۆ ئەوەی هیچ کەس بۆی نەبێت پیایدا تێپەڕ ببێت، ئەمانە هەمووی موفاجەئە دروست دەکات بۆ ئەوانی تر، وایان لێدەکات کە بزانن ئێمە نوێژ دەکەین و لەم عیبادەتەدا دەژین، ئەم حاڵەتە حاڵەتێکی زۆر تایبەتە، رێگە نادرێ هیچ کەسێکی تر دەخالەتی تێدا بکات، رێگە نادری هیچ کاروبارێکی دنیایی تێکەڵ ببێت.

## بانگدان و "دە" سەرسوڕهێنەرەکانی

**الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر**

خودا لە هەموو شتێك گەورە و باڵادەسترە، خودا لە هەموو شتێك گەورە و باڵادەسترە.

خوا لە هەموو شتێك گەورە و باڵادەسترە، خودا لە هەموو شتێك گەورە و باڵادەسترە.

**أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن لا إله إلا الله**

شایەتی دەدەم هیچ شتێك شایستەی پەرستن نییە تەنها خودای گەورە نەبی.

شایەتی دەدەم هیچ شتێك شایستەی پەرستن نییە تەنها خودای گەورە نەبێ.

**أشهد أن محمدا رسول الله، أشهد أن محمدا رسول الله**

شایەتی دەدەم کە موحەممەد نێردراوی خودایە، شایەتی دەدەم کە موحەممەد نێردراوی خودایە.

**حي على الزكاه، حي على الزكاه....**

وەرن بۆپاکبوونەوە، وەرن بۆ پاکبوونەوە....

ئایا هیچ کات گوێتان له بانگی لەو شێوەیە بووە؟ بەڕاستی منیش گوێم لێنەبووه.. ئەوه بانگێك بوو بۆ ئەوەی خۆم و ئێوەش دەربێنم لەو ئولفەتپێوەگرتنەی ڕێگریمان لێدەکات گوێمان لە دەقی بانگەکە بێت یان وتنەوەی بەو شێوەیەی کە بیلال گوێی لێبووە وتوویەتەوە.

بانگ و قامەت لەو دەقە گرنگانەن کە بوون بە قوربان و زاڵبونی ئولفەت و عادەت پێوەگرتنمان لەگەڵیان، ئەگەرچی ئەو هەموو مانا و کاریگەریە سەرسامە لە ڕۆڵ و دەقەکانیاندا هەیە، لێرەدا هەوڵ دەدین دەست بخەینە سەر "دە" دانەیان بەلایەنی کەمەوە، کە ئەمانە ئەوانەن کە مرۆڤ یان بەلایەنی کەمەوە من توانیومە پەییان پێبەرم و ئاشکرایان بکەم تیایاندا:

**یەکەم:** ئایا هیچ کەسێکمان بیری کردۆتەوە، یان هیچ جار پرسیاری کردووە: بۆچی تەنها نوێژ لەناو پێنج روکنەکانی ئیسلامدا تایبەتکراوە بەم ئاگاداری و بانگکردنە لە پێش ئەنجامدانیدا؟ بۆ بانگ نادەین بۆ ڕۆژوو؟ بۆچی قامەت و بانگ ئەنجام نادەین بۆ ڕۆژوو و زەکات وەك ئەو بانگەی دامانهێنا تۆزێك لەمەوپێش و ناڵێین: حي على الزكاة؟

گریمانەکانی ئێمەی مرۆڤ ناتوانێت دەرك بکات بەو حیکمەت و کاربەجێییانەی کە هەن لە تایبەتکردنی نوێژ بەم پێشەکییە، بەڵکو ئەو دوو پێشەکییە: بانگ و قامەت، بەڵام لە یەکەم وردبونەوەدا دەتوانین لە گرنگی ماناکانی بانگ تێبگەین، ئەویش ئەوەیە کە ئاگاداری موسوڵمانان دەکاتەوە و بیریان دەخاتەوە، بەڕاستی دەبێ بزانین کە نوێژ ئەرکێکی تاکی نییە بە تەنها مرۆڤەکان ئەنجامی بدەن، بەڵکو بە پلەی یەکەم واجبێکی دەستەجەمعی هابەشە، بانگدانیش تەواوکردنی ئەو دەستەجەمعیەیە بۆ نوێژ، بانگهێشتکردنی ئەنجامدەرانیەتی بۆ ئەوەی بێن بەیەکەوە بە دەستەجەمعی ئەنجامی بدەن لە یەك کاتدا، لە یەك شوێندا، لە دوای یەك پیاوەوە، پشتڕاستکرنەوەی ئەوەیە کە نوێژ تەنها پەیوەندییەکی تاکی نییە

لەنێوان خوا و بەندەکانیدا، بەڵکو لەوە تێپەڕ دەکات بۆ کۆبوونەوە و بەیەکگەیشتنی موسوڵمانان بەیەکتر و نزیکبوونەوە و شانبەشانەوەنان و تێگەیشتن لە یەکتر و یەکتر خۆشویستن لە نێوان بەندە و باقی بەندەکانی خوادا لە ئوممەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر)، هەر لەبەر ئەوەشە کە نوێژە سوننەتەکان نە بانگ و نە قامەتیان ناوێت، چونکە ئەوانە نوێژی تاکین و بەتەنها ئەنجام دەدرێن.

بەڕاستی ئەمە یەك رووی شارستانیی نوێژە لە نێو رووە زۆرەکانی، کە لە ئەڵقەیەکدا بەدرێژی باسی دەکەین بەناونیشانی (نوێژی جەماعەت نهێنی شارستانییەتە).

**دووەم:** بۆ تەشریعبوونی بانگ و قامەت، چیرۆکێکی سەرسوڕهێنەر هەیە ئەگەر وەحی و سروش نەبن ئەوە نزیکیان دەکاتەوە لە پلەی وەحی خودایی، بەڵام لەگەڵ جیاوازی لە هۆکار و کەسەکان.

جیاوازی لە ڕووی هۆکارەوە ئەوەیە کە لە خەودا هاتوون و لە ئاگابووندا نەهاتوون، جیاوازی لە کەسەکانیشدا ئەوەیە کە لە خەونی چەند صەحابەیەکدا هاتووە نەك لە خەونی پێغەمبەردا هاتبێت.

دوو هاوەڵ یەك جۆرە خەونیان بینی، لە یەك شەودا و وشەکانی بەیەك جۆر، بەیەك جۆر درێژی وردەکاری، بەڵام خاڵی لە هەموویان گرنگتر و لە هەمویان وروژێنەتر لە رووداوەکەدا ئەوە بوو کە عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێبێت) خەلیفەی دووەمی موسوڵمانان، یەکێك بوو لەو دوو هاوەڵە.

ئەم لەدایکبوونە تایبەتەی بانگ، هیچ شتێك رکابەری لەگەڵ ناکات و نارژێتە تاقانەیی و تایبەتمەندیەکەیەوە، تەنها لەدایکبوونی نوێژ نەبێت، چونکە ئیسلام هەمووی بە قورئان و سونەتەوە هەمووی لە ڕێگەی وەحیەوە دابەزیوە، تەنها نوێژ نەبێت، بەڵام نوێژ ئەوە پێغەمبەری خودا بانگهێشت کرا بۆ ئاسمان، بانگهێشتکردنێکی ڕێزدارانەی تایبەت بۆ وەرگرتنی وردەکاریەکانی لە لایەن خودای

گەورەوە، هەروەها تەنها بانگدانیش کە خودای گەورە گەیاندیە پێغەمبەرەکەی لە رێگەی ئەم دوو هاوەڵە بەیەکەوە و بەشێوەیەکی هاوتەریب و ناوازە.

**سێیەم:** بانگدان لە حەقیقەتیدا و لە پێکهاتە و ماناکانیدا وەك نوێژێکی پێشەکی کورت وایە، موسوڵمان ئامادە دەکات بۆ نوێژێکی دورودرێژ کە بەدوایدا دێت. سوننەت کراوە بانگدان بە گوێی منداڵێکی تازە لەدایکبوو وەك بڵێی ئەمە نوێژێکی پێش وەختیە ئامادەی دەکات بۆ نوێژێکی دورودرێژ کە هەموو ژیانی دەگرێتەوە، وەك بڵێی بانگدان بە هەموو منداڵێکی تازە لەدایکبوو بڵێت: ئەی مرۆڤ تۆ هاتیتە ژیانەوە، کەواتە خۆت ئامادە بکە بۆ نوێژ و عیبادەت و پەیوەستی روحی لەگەڵ خوادا کە تەنها بە دەرچوونی تۆ لەم دنیایە کۆتایی دێت، لەو کاتەشەوە گەشتی دوورودرێژی ئاخیرەتت دەستپێدەکات کە جیاوازە لە گەشتە دنیاییە کورتەکەت.

ژیانمان بە هەموو وردەکاریەکەیەوە هیچ نییە تەنها جۆرێك لە نوێژ کردن نەبێت، بەڵام بەچەند رێگەیەکی جیاواز و جۆراوجۆر. باشە قورئان ئاماژەی بەوە نەداوە کە ژیانمان هەمووی لە لەدایکبونەوە تا مردن هیچ نیە و بۆ هیچ نییە تەنها بۆ عیبادەت نەبێت کە ئەنجامی دەدەین بۆ خودای گەورە ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ {الذاريات: ٥٦}، واتە: (مرۆڤ و جنۆکەم بۆ هیچ شتێك دروست نەکردووە تەنها بۆ پەرستش نەبێت)، تۆ کاتێك خۆت فێری زانیاری دەکەیت کەواتە تۆ لە نوێژدایت، تۆ کاتێك کار و کاسبی دەکەیت بۆ بژێوی خۆت و خێزانەکەت، کەواتە تۆ لە نوێژدایت، تۆ کاتێك خزمەتی کۆمەڵگا و خەڵك دەکەیت، کەواتە تۆ لە نوێژدایت، تۆ نان دەخۆیت بۆ ئەوەی بژیت و بەهێز بیت، کەواتە تۆ لە نوێژدایت، گرنگی بە لەشساغیت دەدەیت، کەواتە تۆ لە نوێژدایت.. ژیانمان لە ئەلیفەوە تا یا هەمووی عیبادەت و نوێژە.

زۆر وردبەرەوە لە مانای وشەکانی بانگ، بۆت دەردەکەوێت تەنها نوێژێکی کورتە و ئامادەسازی دەکات بۆ نوێژێکی درێژ.

**چوارەم:** وادابنێ تۆ ئەمە یەکەمجارە گوێت لە بانگ دەبێت و پێشتر بەهیچ شێوەیەك گوێت لێنەبووە، وابێنە زیهنتەوە، کە تۆ ئەمە یەکەمجارە گوێت لە وتەی "الله أكبر" دەبێت، بیر لە ماناکەی، لە پێکهاتە زمانەوانیە تایبەتەکەی بکەرەوە، ئەم وتەیە رستەیەکی تەواو نەکراوە لە رووی زانستی نەحوی عەرەبیەوە، چونکە بەم شێوەیە بەڕووی هەموو پاشگرێکدا کراوەیە کە خەیاڵ و واقیعیەت تەواوی بکات: "الله أكبر– خودا گەورەترە".. لەو دنیایەی کە "الله أكبر" من لادەبات لە سەرقاڵبوون پێوەی.. لەو ماڵ و سامانەی لەبەردەستمدایە، "الله أكبر" لەو خەم و پەژارەیەی کە ژیانم ناخۆش دەکات.. لەو دوژمنەی رووبەڕووم دەبێتەوە، "الله أكبر" لەو هەموو لوتبەرز و سنوورشکێنانەی کە دەمچەوسێننەوە..هتد.

"الله أكبر" وتەیەکە هەموو بانگی کورت کردۆتەوە، چەقی ئەم بانگ کردنە سەرسوڕهێنەرەیە کە تایبەتکراوە بە ئیسلامەوە، بەڵکو وتەیەکە هەموو ئیسلامی گرتۆتەخۆی بە تەواوی، ئێمە موسوڵمانین چونکە بانگی خۆ تەسلیمکردن و ملکەچی و دانپیانانمان لێداوە کە کەسێك هەیە گەورەترە و باڵادەسترە لە هەموو شتێکی تر، بۆیە ئێمە ملکەچی ئەوین و خۆمان تەسلیم بەو کردووە، بەکورتی: "گوتاری ئیسلامە".. (الله أكبر ـ ئیسلام).

**پێنجەم:** بانگ بەشێوەیەك هاتووە وشەکانی کورت و دیاریکراوبوون و لە شێوازێکی زمانەوانی ناوازە و تازەدا بووە لەسەر عەرەب و غەیری عەرەب. ئەم شێوازە پێش سەردەمی خۆی کەوتووە بەچەند سەدەیەك، بڕوانە بەشێوەی چەند رستەیەکی پچڕ پچڕی کورت، هیچ وشەیەکی لێکدان و ئامڕازەکانی پەیوەندییان لە نێواندا نییە، وەکو "إن، قد، لقد، الواو، ف.. هتد"، ئایا ئەم شێوازە شێوازی نامە خێراکانی مۆبایلەکانی ئەم رۆژەت بیر ناخاتەوە؟ بەڕاستی بانگ بەم وشە کورت و کەمە روونانەی رۆحی بانگەوازە تازەکەی بۆ عەرەب و موسوڵمانان کورت کردەوە، کە لەبەر ئەو بانگەوازە پشتیان کردە بت و عەقیدە و نەفامییەکانیان.

**شەشەم**: بەڵام سەرسوڕهێنەرتر لەوەش ئەوەیە کە ئەم نوێژە کورتە بەهۆی ئەم زمانە و ئەو پەیامە خێرایەی کە هێناویەتی دەگونجێت لەگەڵ زمانی گرنگترین بەش لە نوێژە گەورەکەمان: کە سورەتی "الفاتحە"یە، باشە ئەم سورەتەش لە پەیامی خێرا ناچێت؟ دەبینین هیچ ئامرازێکی پەیوەندی لەو ئامرازانەی کە پێی راهاتوین و عەرەب ئاشنایە پێیان لە نێوان ئایەتەکانیدا نییە.

ئێمە بە ﴿الحمد لله– هەموو سپاس و ستایشێك بۆ خودای پەرستراوە﴾ دەستپێدەکەین کە ﴿رب العالمین– پەروەرێنی جیهانەکانە﴾ە، هەر ئەو ﴿الرحمن الرحیم– بەسۆز و میهرەبانە لە دنیا و قیامەتدا﴾ و هەر خۆی ﴿مالك یوم الدین– خاوەنی هەموو شتێکە لە رۆژی دواییدا﴾، ئەوەتا خودایە گیان ئێمە جەخت دەکەینەوە لەوەی کە ئێمە ﴿إیاك نعبد وإیاك نستعین– تەنها تۆ دەپەرستین و تەنها پشت بە تۆ دەبەستین﴾ لە هەموو کاروبارەکانی ژیانماندا، بۆیە رووت تێدەکەین بەداواکردن لێت و دەڵێین ﴿ إهدنا الصراط المستقیم...– رێنماییمان بکە بۆ سەر رێگەی راست﴾..{بگەڕێرەوە بۆ کتیبەکەمان بەناوی "المعجزة" کە بەم زووانە چاپ دەکرێت لەلایەن پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامییەوە}.

**حەوتەم**: بەهۆی ئەو پێگەیەی کە بانگ هەیەتی لە پەرستشەکانماندا چەند ئاداب و پێداویستیەکی هەیە، بۆیە لەسەرمان پێویستە کە ئاوێتە بین لەگەڵیدا و وەڵامی وشەکانی بدەینەوە وشە بە وشە وەك لە فەرموودەدا هاتووە، وەڵامی هەر وشەیەك دەبێتە صەدایەك بۆ وشەکان، هەر بەوەشەوە ناوەستین، بەڵکو کۆتایی دێنین بە دووبارەکردنەوەی هەندێك رستە و وشە کە لە پێغەمبەری خواوە بۆمان تەشریع کراوە و لەگەڵ بانگبێژ دەیڵێینەوە.

**هەشتەم**: هەروەها جێی سەرسوڕمانە پێکهاتەکانی ئەم ئاوازبەندیە زمانەوانیە سەرسوڕهێنەرە لەنێوان بانگ و نوێژدا، ئەو پێکهاتە زمانەوانەییە دوانەییەیە کە بانگی لێپێکهاتووە کاتێك کە هەر رستەیەکی دووجار دووبارە دەبێتەوە، ئەم

دووبارەبوونەوەیە لە روویەکەوە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی کەسایەتییە زمانەوانیە سەربەخۆکەی، بەڵام لەوەش گرنگتر و سەرسوڕهێنەرتر ئەوەیە کە دەکرێت ببێتە هۆی بەهێزبوونی ئاوازبەندی لەگەڵ پێکهاتەی گشتی نوێژ.

ژمارە (دوو) لە ژمارە میحوەریە بڵاوەکان نییە لە پەرستش و زیکر و ویردە ئیسلامیەکاندا، چونکە ژمارە بڵاوەکان زیاتر ژمارە حەوت و دە و بیست و حەوت و سی و سێ و نەوەد و نۆ و سەدن، لەگەڵ ئەوەشدا کەچی رستەکانی بانگ دوو دوو دووبارە دەبنەوە، بۆیە ئاوازبەند دەبن بەم دووبارەییە لەگەڵ پێکهاتەی نوێژەکانمان لەکاتێکدا کە هەردوو دەستمان بەرز دەکەینەوە بۆ "الله أكبر"ی دەستپێکی نوێژ، دادەنیشین لەدوای هەموو دوو رکاتێك، لەهەر رکاتێکدا دوو جار سوژدە دەبەین، لە کۆتایی نوێژەکانماندا دوو جار سەلام دەدەینەوە، ئا ئەمە جارێکی تر ئەو هەستەمان لا بەهێز دەکات لەو کاتەی کە بانگ دەڵێین کە پێمان دەڵێت بانگ نوێژێکی کورتە، بەڵام بە دەنگی بەرز ئەنجام دەدرێت.

**نۆیەم:** هیچ جارێك هەستتان کردووە بەوەی کە گوتەکانی ناو بانگ چەند بەشێوەیەکی بێلایەنانە هاتوون، بەبێ ئاماژەی گەڕانەوە بۆ هیچ لە کەسەکان و ئاوەڵناوەکان، نە بۆ کەسی یەکەم – قسەکەر– نە بۆ کەسی دووەم، نە بۆ تاك و نە بۆ کۆ، هەمووی بەم شێوەیەیە تەنها شایەتمانەکان نەبێت، چونکە مانای بەرپرسیارێتی تاکلایەنە لەخۆدەگرێت، ئەم بەرپرسیاریەتە زۆر بەگرنگەوە لە زمانی ئەوانەی دەشیلێنەوە بەرجەستە دەبێت کە بە شێوازی قسەکەر –متكلم– دێت و ماناکەی وایە: (من شایەتی دەدەم). جگە لە شایەتمان هەموو ناوەرۆکی بانگ بێلایەنانە هاتوون، تەنانەت وشەی (حَيّ)ش پەیوەست نییە بەهیچ راناوێکەوە، نە بە تاك، نە بە کۆ، نە بە نێر، نە بە مێ.

ئەم شێوازە زمانەوانییە بێلایەنە ناوازەیە لە زماندا، زۆرکات تایبەتە بە زمانی زیکر و ویرد و نوێژەکانەوە، بەڵام بەم بێلایەنییەوە جارێکی تر ئاوێتە و ئاوازبەند

دەبێتەوە لەگەڵ شێوازی سورەتی (الفاتحة) – كۆڵەكەی نوێژ –، باشە نیوەی یەكەمی سورەتی (الفاتحة) بەم شێوازە ناوازەیە نەهاتووە؟! ئەم شێوازە جوانەیە داماڵراوە لە رەهەندی كات و زەمەن، هیچ یەكێك لەو سێ ئاوەڵناوانەی تێدا نییە كە رەهەندەكانی دەسەپێنێت بەسەر زمانماندا و عادەتەن بەوان دەستپێدەكەین لە زۆربەی وتە و نووسینەكانمان.

**دەیەم:** رەنگە هەندێك لە ئێمە ئێستا وا هەست بكات كە بانگدان كارێكی لاوەكی زمانەوانیە، پێویستی بەو هەموو گرینگی پێدانە نییە وەك نوێژەكانمان، بۆیە زۆر بە بایەخەوە سەیری ناكەین و ئەنجامی نادەین لە پێش نوێژەكانمان، بەڵام ئەو پێغەمبەرە دڵسۆز و ئەمینەمان وامان پێناڵێت، بەڵكو زۆر هانمان دەدات لەسەر ئەنجامدانی، وەك دەفەرموێ:

ـ ((ما مِنْ ثَلاثةٍ لا يَؤَذِّنونَ وَلا تقامُ فيهِم الصّلاةُ الاّ اسْتَحوَذَ علَيهِمُ الشَّيطانُ))

*{رواه أحمد عن أبي درداء}* .

واتە: (هیچ سێ كەسێك كە بەیەكەوەبن و بانگ و قامەت ئەنجام نەدەن ئەوە شەیتان زاڵ دەبێت بەسەریاندا).

ـ عن عَبدِ اللهِ بن عَبدالرَّحمن بن أبي صَعصَعة عن أبِيهِ، قال: (إنّ أبا سعيد الخُدري قال له: إني أراك تُحبُّ الغَنمَ والباديَةَ، فإذا كُنتَ في غنَمِكَ أو بادِيَتِكَ فأذَّنتَ بِالصّلاةِ فارفَع صَوتَكَ بِالنِّداءِ فَإِنَّهُ لا يَسمَعُ مَدى صوتِ المُؤذِّنِ جِنٌّ وَلا إنس ولا شيءٌ، إلاّ شَهِدَ له يومَ القِيامَةِ). *{رواه البخاري}* .

واتە: (عەبدوڵڵای كوری عەبدولرەحمانی كوڕی ئەبو صەعصەعە لە باوكیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ئەبو سەعیدی خودری پێی وتم: وا دەتبینم كە مەڕومالات و دەشتودەرت خۆش دەوێت، هەركاتێك كە لەناو مەڕەكانت بووی یان لە دەشتودەرەكەت بووی و بانگت دا، ئەوە دەنگت بەرز بكەرەوە، چونكە هەر جنۆكە، یان مرۆڤ، یان هەر بوونەوەریك گوێی لە دەنگی بانگدەر بێت، ئەوە

شایەتی بۆ دەدات لە ڕۆژی دواییدا).

باشە ئەگەر ئەم بانگە تەنها هۆکارێکی ئاگادارکردنەوەی نوێژە، مەڕومالات و بوونەوەر و شتە بێگیانەکان چ پێویستیەکیان پێیەتی و چ پێویستییەکیان بە گوێلێبونیەتی؟ باشە چۆن شەیتان زاڵ دەبێت بەسەر ئەوانەدا کە بانگ نادەن؟ بەڕاستی ئەو ئاماژە و فەرموودە پێغەمبەریە بەخشندەییانە بڵندگۆ و ڕێنیشاندەر بوون بۆ موسڵمانانی پێشین، قیمەتی بانگ و قامەت و ڕۆڵی پەرستشیانی لە ژیانیاندا نیشانداون، بۆیە تۆش هەوڵ بدە ئەم پەرستشە لە دەستت دەرنەچێت.

کەواتە باش ئەم زانیاریانە لەسەر بانگ ئەگەر ئەمڕۆ لێت بپرسن: نوێژەکان چەند جۆرن؟ دەڵێیت: نهێنی، ئاشکرا، بەدەنگی بەرزەوە –مەبەستم لەمەی سێیەم بانگە–، بەڕاستی بۆ هەریەك لەم سێ نوێژە ڕۆڵی جیاواز و گرنگ هەیە، کاریگەری تەواوی هەیە لەسەر ژیانمان و چاکبوونی کاروبارمان.

بانگ پڕۆژەیەکی وەبەرهێنانی کورتکراوەیە، ئامادەکاری دەکات بۆ پڕۆژە وەبەرهێنانە کۆمەڵیە کۆتاییە گەورەکە: ئەویش نوێژە.

## هەردوو دەستنوێژەکە

ـ ((لَولا أنْ أشُقَّ على أُمّتي لأمرتُهمْ عِند كُلِّ صلاةٍ بِوضوءٍ، ومَعَ كُلِّ وضوءٍ بسِواك)) *{رواه أحمد وصححه الألباني، عن أبي هريرة}* .

واتە: (ئەگەر بەقورسم نەزانیبا لەسەر گەلەکەم ئەوا فەرمانم پێدەکردن کە لەگەڵ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرن و لەگەڵ هەموو دەستنوێژێکیش سیواك بکەن).

زۆر جار لەبەردەم ئەم فەرمودەیەدا هەڵوێستەم کردووە و پرسیارم کردووە: بۆ لەگەڵ هەموو نوێژێك دەستنوێژ بگرم، باشە مادام من دەستنوێژم هەیە و پاکم؟! بۆچی پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) هانم دەدات لەگەڵ ئەنجامدانی

هەموو نوێژێك دەستنوێژ تازە بکەمەوە؟! باشە ئەگەر دەستنوێژم هەبێت و تازەی بکەمەوە، ئەمە زێدە مەسرەفیی نییە لە ئاودا؟ چ جای ئەوەی ئەم وەسیەتە لە ناوچەرگەی بیابانێکی کەم ئاودا کراوە، لە وڵاتی کانیاو و رووبارە گەورەکاندا، یان لە شەلالەکانی "نیاگارا"دا نەوتراوە.

سێ کتێبە ئاسمانیەکەم خوێندۆتەوە، ئەوەندەم لێخوێندۆتەوە لە وتەکانیان کە خودا فرسەتی داوم، هیچ ئاینێکم نەبینیوە کە بیروباوەڕەکەی و نوێژەکەی و پەرستشەکانی و شارستانیەتەکەی بەستبێتەوە بە پاکیی و خۆشۆردن و دەستنوێژەوە وەك ئەوەی ئیسلام کردوویەتی، هیچ پێغەمبەرێکم نەدۆزیەوە وەسیەتی کردبێت بۆ گەلەکەی بە پاك و خاوێنی و خۆجوانکردن جوانی ئاکار و رواڵەت وەك ئەوەی پێغەمبەری خودا موحەمەد (درودی خودای لەسەر) کردویەتی بۆ گەلەکەی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین گەلی موسوڵمانان لەکوێن لە بەرامبەر رێنماییەکانی ئیسلام؟!

ئەم جەختکردنەوەیە لەسەر دوبارەکردنەوەی دەستنوێژ، تەنها لەبەر ئەوە نییە کە پاك و خاوێنی دیاردەیەکی تەندروستی و شارستانییە، ئەمە ئامانجێکی روون و داواکراوە لە ئامانجەکانی شەریعەت، بەڵام لەبەرئەوەیە کە لێرەدا خۆی دەبینێتەوە لە دەستنوێژدا، هەروەها پەیوەستیشە بە پاککردنەوەی دەروون و ناواخنی مرۆڤ، چونکە پاك و خاوێنی دەرەکیت پەیوەستە بە لاشە و جل و بەرگت لە هەموو چڵك و پیسییەك بەتەواوی، لە کۆتاییدا رەنگدانەوە و وێنای راستگۆیانەی پاك و خاوێنی دڵ و دەروونتە، پێویستە رەنگبداتەوە بەتەواوی (بۆیە هەندیك لە مەزهەبە فیقهیەکان غەیبەتکردن بە یەکێك لە هۆکارەکانی دەستنوێژ شکاندن دەزانن).

بە ڕەچاوکردنی ئەم لۆجیکە، دەکرێت بڵێین ئێمە دوو جۆر دەستنوێژمان هەیە: دەروونی و دەرەکی، یەکەمیان گرنگترە، چونکە بەبێ یەکەمیان سوود لە دووەم وەرناگرین، چونکە کەسێك کە رۆچووبێت لە چڵکی و پیسیدا، چۆن دەتوانێت

دەستنوێژ بگرێت؟ بۆیە پێویستە بۆخۆت جەخت لەسەر ئەم بابەتە بکەیتەوە کاتێك کە کرداری پاککردنەوە ئەنجام دەدەیت لەسەر ئەندامە دەرەکیەکانت، پێویستە ئەم کردارەت ئەنجام دابێت لەسەر ئەندامە دەروونیەکانیشت، دیارە ئەمەش نە بە دەستنوێژ و نە بە تەیەمموم ناکرێت، بەڵکو بە خۆڕزگارکردن دەکرێت لەو پیس و پۆخڵیانەی دەروونت کە لە ناختدا کەڵەکە بوون، لە رق و کینە و حەسودی و تووڕەیی و غەیبەت و خودپەرستی و درۆ و هەڵخەڵتاندن و ئازاردانی خەڵك و زماندرێژی و دڵپیسی و دڵ خراپی و گوناھ و بەدگومانی و بەدنهێنی.

نیەتت ساغ بکەرەوە لەسەر ئەوەی کە ئەم شەخەڵ و پیسیانە پاك بکەیتەوە، ئەگەر قۆناغ بە قۆناغیش بێت، بۆ ئەوەی بتوانی تەوێڵ و دڵ و رۆح و وشەکانت یەکلا بکەیتەوە بۆ خودا، کە نزیك بویتەوە لە راوەستان لەبەردەمیدا بۆ بەرزکردنەوەی وتەکانت بۆی و ئەویش لێتیان قەبوڵ بکات، موناجات بکەی لەگەڵیدا و گوێت لێبگرێت و داوای لێخۆشبونی لێبکەیت و ئەویش لێتخۆش بێت:

ـ جاءَ رجُلٌ إلى النبي (صلى الله عليه وسلم) فقال إنّ فُلانًا يُصلّي باللَيلِ فإذا أصْبحَ سرَق، فقال: ((إنّه سَينْهاهُ ما تَقولُ)) –أي ستنهاه صلاتُهُ عن السّرقَة– *{مشكاة المصابيح وصححه الألباني، عن أبي هريرة}* .

واتە: (پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) پێی وت: فلان کەس شەونوێژ دەکات، بەڵام کە بەیانی بۆیەوە دزی دەکات، ئەویش فەرمووی: (لەمەودوا نوێژەکەی نەهی لێدەکات لە ئەنجامدانی ئەو کارەی)، واتە نەهی لێدەکات لە دزیکردن.

ـ ((أَتَدرونَ مَن المُفلِس؟)) قالوا: المُفلِسُ فينا مَن لا دِرهَمَ لَهُ ولا مَتاع. فقال: ((إنَّ المُفْلِسَ مِن أُمَّتي يَأتي يَومَ القِيامَةِ بصَلاةٍ وَصِيامٍ وَزكاةٍ، ويَأتي قَدْ شَتَمَ هذا، وقَذَفَ هذا، وَأَكَلَ مالَ هذا، وسَفَكَ دَمَ هذا، وضَرَب هذا، فَيُعطى هذا مِنْ حَسناته، وهذا مِنْ حَسناتِهِ، فإن فَنِيَتْ حَساناتُهُ قَبلَ أن يُقضى ما عَلَيهِ، أُخِذ مِنْ خَطاياهُم

فَطُرِحَت علَيهِ، ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّار)). {رواه مسلم}. واته: (ئايا دەزانن موفليس كێيە؟ وتيان: موفليس لە ناو ئێمەدا ئەوەيە كە نە درهەم و نە كالآى ببێت، فەرمووى: (بەڕاستى موفليس لە ئوممەتى من ئەو كەسەيە كە ڕۆژى قيامەت بە نوێژ و ڕۆژوو و زەكاتەكەيەوە دێت، بەڵام دێت جنێوى داوە بەم، وە بوختانى بۆ ئەو كردووە و ماڵى فلاَن كەسى خواردووە، خوێنى فلاَن كەسى رشتووە، لەوى داوە، بۆيە لە خێرەكانى ئەم، بەشى فلاَن كەسى لێدەدرێت و بەشى فيسار كەسى لێدەدرێت، كە مافيان هەيە بەسەريەوە، وە ئەگەر چاكەكانى تەواوبوون پێش ئەوەى مافى خەڵكى تەواو ببێت بەسەريەوە، ئەوە لە خراپەكانى ئەوان هەڵدەگيرێت و دەخرێتە سەر چاكەكانى ئەم، پاشان هەڵدەدرێتە ناو ئاگرەوە).

دەبێ چەند موفليسمان تێدا بێت؟ دەبێت چەند لە ئێمە پەرستشەكانى جيابن لە مامەڵە و هەڵسوكەتەكانى؟ دەبينيت زۆر ركوع و زۆر سوژدە دەبەن، لە دەموچاوياندا نيشانەى سوژدەكە ديارە، بەڵام كاتێك مامەڵە دەكەيت لەگەڵيدا كاريگەرى ئەو نيشانەى سوژدەيە نابينيت تيايدا.

ـ ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾ {العنكبوت: ٤٥}. واتە: (بەڕاستى نوێژكردن بەرهەڵستى لە گوناه و تاوان و نادروستى دەكات).

دياردەى جياكاريى لەنێوان پەرستش و مامەڵەكردن لەلايەن موسوڵمانانەوە بۆتە خەتەرناكترين دياردەى شێواندنى وێنەى ئيسلامى راستەقينە لەبەردەم جيهاندا، پێغەمبەرى خودا (دروودى خوداى لەسەر) بەهيچ شێوەيەك ئەم جياكاريەى نەدەكرد، ئەو كاتێك قورئانى بۆ دەهاتە خوارەوە خەڵكى فێرى قورئان و كاركردن پێى بەيەكەوە دەكردن:

ـ عن أبي عَبد الرَّحمن السلميّ عن عُثمان وابن مسعُود وأُبيّ بن كعب: (أنَّ رسول اللهِ (صلى الله عليه وسلم) كانَ يُقرئهُم العَشرَ– أي عشر آيات– فَلا يتَجاوَزونَها إلى عَشرٍ أُخرى حَتى يتَعلّموا ما فيها مِن العَمل، فَتعَلّمنا القُرآن والعَملَ جَميعًا). {تفسير

القرطبي (١/ ٣٩)}. واتە: (لە باوکی عەبدولڕەحمانی سوللەمییەوە لە ئیمامی عوسمان و ئیبن مەسعود و ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) کاتێك دە ئایەتی فێر دەکردن بەسەریدا تێنەدەپەڕین بۆ دە ئایەتی تر هەتا هەموو ئەو شتانە فێر نەبونایە کە ئەم دە ئایەتە دەیگرێتە خۆی لە لایەنی کرداری، بۆیە دەفەرموون: قورئان و کارکردن پێی بەیەکەوە فێر بووین).

پێویستە جارێکی تر پەرستشەکانمان بدۆزینەوە، جارێکی تر نوێژەکانمان بدۆزینەوە، جارێکی تر رۆژانە دەستنوێژ بدۆزینەوە و ماناکانی بەرجەستە بکەین، ئەم پەرستشانە جارێکی تر بدۆزینەوە هەرکاتێك راهاتنی بێناوەڕۆکی کوشندە ویستی هەستکردن بە گەورەیی ئەم دروشمە ئیسلامیە ناوازەیەمان لا سادە بکات کە لە هیچ ئاینێکی تردا بەدیناکرێت.

هیچ کاتێك تاقیت کردۆتەوە بچیت بەپوختی دەستنوێژ بگریت بەشێوەیەك کە وەك ئەوەی یەکەم جارت بێت گوێت لە شێوازی دەستنوێژگرتن بووبێت و ئەنجامی بدەی؟ جارێك تاقی بکەرەوە پاشان بگەڕێرەوە لای دەروونت و بزانە چیت دۆزیوەتەوە تیایدا بۆ یەکەمجار؟ ئەگەر بەوردی بیری لێبکەیتەوە زیاتر بۆت دەردەکەوێت کە دەستنوێژ لە راستیەکەیدا وەك نوێژ وایە، بەرنامەی ژیانە.

**یەکەم:** بریتییە لە پاکوخاوێنی، دیارە رۆشنبیران بە پاکوخاوێنی جیا دەکرێنەوە، **دووەم:** گرنگیدان و وردەکاری و موتابەعەکردنە، سەرکەوتووەکانیش بەمانە جیا دەکرێنەوە، **سێیەم:** یاسا و رێسا و رێکخستن و پارێزگاریکردنە لە مەوعید و بەڵێن و مەرجەکان: دیارە بەمەش ئەو کەسانە جیادەکرێنەوە کە بەئاگان لەناو پەرستشەکاندا، **چوارەم و پێنجەم.. و دەیەم** بەخۆداچوونەوەیەکی بەردەوام و پێکۆڵیەکی زۆرە لە دەروون و پاککردنەوەیەتی لە هەموو ئەو شتانەی پێوەی نوساون لە چڵك و شەخەڵی ژیان لەنێوان دوو دەستنوێژدا، بەمەش موسوڵمان لە ناموسڵمان جیا دەکرێتەوە، خواترس لە کەسی لە خوانەترس و نەگەڕاوە بۆ لای

خودا و بێئاگا و فەوتاوەکان جیا دەکرێنەوە، تەنانەت بە دەموچاو ئەمانە لە یەکتر جیا دەکرێنەوە، تەنانەت هەندێکجار بیٚ دەستنوێژ لە کەسانی بەدەستوێژ جیادەکرێنەوە.

تەیەموم وەك ئامێرێکی بێتەل وایە — لەم کاتەدا نامەیەکی بیٚ ئاوییە— بۆ دلٚ، پێی دەڵێت ئامادەبە ئەی دلٚ بۆ بەخزمەتگەیشتنی خودا، خۆت نەجات بدە لە هەموو شتێك کە ئەو بەیەکگەیشتنە چاوەڕوانکراوەت لەگەڵیدا تێك بدات، چونکە ئەو هەموو نهێنیەکانی تۆ دەزانێت، ئاگای لە شتە پەنهان و ئاشکراکانت هەیە، بەڵام دەستنوێژ بەم مانایە — نامەیەکی بە ئاوییە — هەمان پەیام و ئاماژە دەگەینێت بە دلٚ، بەڵام بە شێوەیەکی تر.

وشەی (الوضوء) لە وشەی (ضوء— ڕووناکی) وەرگیراوە، چونکە ئەم دەستنوێژە نوور و ڕووناکی دەدات بە دەموچاو و دلٚ بەیەکەوە، ڕووناکی دەموچاویش پەخشی ڕووناکی ناخ و دلٚ و دەروونە.

هەولٚ بدە لە ژیاندا هیچ کاتێکی بیٚ دەستنوێژت نەبێت، وا هەست دەکەیت دەفڕیت بە هەوادا کاتێك دەستنوێژت هەیە و دەچیتە سەرکارەکەت، وا هەست دەکەیت کاتێك بەدەستنوێژەوە سەلام لە خەڵك دەکەیت مەلائیکەکان تۆقەت لەگەلٚ دەکەن، لە ئیش و کارەکانتدا زۆر هەست بە متمانە و سەرکەوتوویی دەکەیت، کاتێك سەر لەسەر سەرینەکەت دادەنێیت بە دەستنوێژەوە، واهەست دەکەیت زۆر بەتەواوی ئەمانەتەکەت گەیاندووە، لە کۆتاییدا خۆت خستۆتە بەردەم زاتێکی ئەمین و بەخشندە و لێخۆشبوو و بەبەزەیی.

## نوێژی جەماعەت: نهێنی شارستانی

هیچ کات پرسیارتان لەخۆتان کردووە وەك من، کە ئایا پێناسەی شارستانییەت چییە؟ ئایا ئامێر و کارگە و کۆمپیوتەر و مووشەك و کەشتی گەورەی ناو زەریا و دەریاکان و فڕۆکە و کەشتییە گەردوونییەکان و مووشەکە ئەتۆمییەکانە؟ لەڕاستیدا ئەمانە هەموویان لە بەروبوومەکانی شارستانیەتن، بەلاّم شارستانییەت بۆخۆی کە ئەم بەروبوومانەی بەرهەمهێناوە، خۆی دەبینێتەوە لە هەشت تۆو، ئەوانیش: پاکوخاوێنی، وردەکاری، رێکوپێکی، پەیوەستبوون بە بەڵێن و وادەکان، رێکخستن و بەڕێوەبردن بە کۆنترۆڵکردنەوە، راستگۆیی و ئەمانەتپارێزی، کاری بەکۆمەڵ یان بەشێوەی گرووپ، لێبوردەیی، ملکەچی، قەبوڵکردنی بەرامبەر، پسپۆڕی، بەرپرسیارێتی تاکی، ئارامگرتن و هیممەتبەرزی و ئەنجامدانی لایەنە قورسەکانی کارەکان و دادپەروەری و یەکسانی.

هەروەها ئایا هیچ کات پرسیارتان لە خۆتان کردووە، وەك من: بۆ نوێژ بە جەماعەت بووە؟ بۆچی لەسەرمانە رۆژانە پێنج جار لە ماڵەکانمان، یا لە نوسینگەکانمان، یان لە دوکانەکانمان، یا لە کارگەکانمان دەربچین، لە چەند کاتێکی دیاریکراودا، بەڵکو زۆر دیاریکراو بەشێوەیەك ئەگەر دوا بکەوین لەدەستمان دەچێت، ئەگەر بۆ پێنج خولەکیش بێت؟ هیچ جارێك پرسیارتان لە خۆتان کردووە، وەك من: بۆ خۆمان دەڕازێنینەوە بۆ مزگەوت وەك فەرمانمان پێکراوە؟ بۆچی تاراتگرتن لەپێشدا؟ بۆچی دەستنوێژ پێش جەماعەت؟ ئایا ئەم کارە تەنها پەیوەستە بە رێزگرتن لە ماڵی خودا؟ ئایا بەتەنها پاکوخاوێنی شایستەمان دەکات بۆ ئەوەی لەبەردەم پەروەردگاردا رابوەستین؟ یاخود مەسەلەکە پەیوەستە بەچەند ئەرکێکی تری شارستانی، پەیوەستە بە پاکوخاوێنی و خۆڕازاندنەوە و خۆڕێکخستنی هاوشان لەگەڵ ئەرکە پەرستشیەکانی تر لە ریزگرتن و ئامادەبوون.

سەبارەت بە پەیوەستبوون بە کاتەکان، ئەوە نوێژی جەماعەت باشترین

قوتابخانەیە موسوڵمان تیایدا دەردەچێت بۆ ئـەوەی شایسـتە بێـت بـە هـەڵگرتنی مەشخەڵی شارسانیەت، تـەنها بـە دواکـەوتنت بـۆ مـاوەی پێـنج خولـەك لـە نوێـژی جەماعەت، واتای ئەوەیە کە لەدەستت داوە و بۆت نییـە داوای خێرەکـەی بکـەیت، باشە ئەم وانە زۆر جوانە کە دووبارە دەبێتەوە لەسەر موسوڵمان، پێنج جـار بـەس نییە بۆ ئەوەی موسوڵمانێك دەربچێت کە نرخی یەك خولەك بزانێت، دەرك بە نرخی ئەو زیانە بکـات کـە بـەهۆی ناپـەیوەسـت بونیـەوە بـە بـەڵێن و کاتەکانـەوە لەگـەڵ خەڵکدا لەدەستی داوە؟

وا رێکـەوت کاتێـك کـە گـەنجێکی تـازە پێگەیشـتوو بـووم، جارێـك گفتوگـۆ – مناقشة–م کرد لەگەڵ شێخ ئەلبانی – خودا لێـی خـۆش بێـت– لەسـەر بیرۆکـەی دووبارەکردنەوەی نوێژی جەماعـەت لەیـەك مزگەوتـدا بـۆ یـەك نوێـژ، بۆچـی ڕێگـە نادرێت بەو کەسـانەی کـە دواکـەوتوون لـە جەماعـەتی یەکـەم ئیمامێـك بـۆ خویـان دابنێن و جەماعەی دووەم بکـەن و کۆمـەڵێکی تـر بـێن جەماعـەتی سـێیەم بکـەن، پاشان چوارەم.. هتد؟

شـێخ ئـەلبانی زۆر توونـد بـوو لـە ڕەتکردنـەوەی دووبارەکردنـەوەی نوێـژی جەماعەت لە یەك مزگەوتدا کـە ئیمـامێکی دیـاریکراوی هەیـە، بـەڵام بەداخـەوە تـا ماوەیەکی زۆر درەنگ حیکمەتی ئەم ڕەتکردنەوە توونـدەیم بۆ دەرنەکەوت، چونکە دووبارەکردنەوەی نوێژی جەماعەت لـە یـەك مزگەوتـدا دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی کۆمەڵ کۆمەڵ و بیروبۆچوونی جیاواز جیاواز لەناو نوێژخوێناندا و سەردەکێشێ بـۆ جیاوازیی دڵەکان و دورکەوتنەوەیان لە یەکتر لە دەرەوەی مزگەوت، پەیوەستبوون بـە یـەك جەماعـەت لـە مزگەوتـدا ڕاهێنـانێکی ئیلاهـی ڕۆژانـەی بەردەوامـە لەسـەر پەیوستبوون بە یەك کات و بە یەك ریز و بە یەك دڵ و بە یەك گەل.

بەڵام پاك و خاوێنی و دەستنوێژ و خۆڕازاندنـەوە، ئـەو شـتانەن کـە ئامادەمـان دەکەن بۆ چوونە ناو مزگەوت و سـازمان دەکـەن بـۆ ڕاوەسـتان لەبـەردەم خـودای

گەورەدا، هەر ئەمانەشن ئامادەمان دەکەن بۆ یانـەی شارسـتانیەت کـە دەرگاکـانی دادەخات بەڕووی ئەوانەی کە مەرجە شارستانیە سەرەکیەکانیان تێدا نییە لـە پـاك و خاوێنی و ئاکارڕێکی و لێوەشاوەیی ڕێکوپێکی، تەنها لە لاشەیاندا نـا، بـەڵکو لـە مزگەوتـــەکانیان و لـــە ماڵـــەکانیان و نوســـینگەکان و لـــە قوتابخانـــەکان و لـــە نەخۆشخانەکان و شوێنە خزمەتگوزاریەکان و ڕێگەوبانەکان و دڵ و دەروونیان و لـە هەموو بوارەکانی ژیانیاندا.

ئـەوەتا ئێسـتا ئێمـە لـە مزگەوتـداین، ئـەم نـاوە تازەیـە بـۆ مـاڵی پەرسـتش و خواپەرستی کە ئیسلام دایهێنا و کردیە ناوی فەرهەنگی زمانەوانیمان، هەموو کات ئەو شێوەیەمان بیر دەخاتەوە کە بەندەکان لە هەموو شێوەیەکی تر نزیکترن تیایدا لە خـودای گـەورە، کـە ئـەویش کـاتی سـوژدەبردنە، سـوژدە واتـای دەبـێ سـەر و ناوچەوان و لوتت لە ئاستی گڵدا بێت، ئەم حاڵەتـەش کۆتـایی پلـەکانی ملکەچـی و خۆشکاندنە، بەقەدەر مل شۆڕکردنەوە و ناوچاوان نزمکردنەوە و خۆ زەلیلکردن بۆ خودای گەورە لەسەر گڵ، ئەوەندە نزیك دەبیتـەوە و پلـەت بـەرز دەبێتـەوە لـەلای خودا لە ئاسمان.

بەم وەرزشە ڕۆژانەییە لە ملکەچیدا کە موسوڵمانان هەموو کاژێرێك و یا دوو کاژێر یان زیاتر ئەنجامی دەدەن بەدرێژایی شەو و ڕۆژ، لەبەرامبەر دروستکەرە گەورەکەیاندا کە لە پەرستش بۆی خۆیان بە زل ناگرن ﴿لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ﴾ {الأعراف: ٢٠٦}، واتە: (خۆیان بەزل ناگرن لە پەرستش بۆ خوداکەیان)، وەك خودای گەورە بۆخۆی وەسفی کردوون و وەسفی مەلائیکەکانیشی بەم شێوەیە کردووە، بۆیە ئەگەر بەبەردەوامی نوێژەکانیان بەخشوع و تەواوی ئەنجامدا، ئەوا ملکەچی و خۆبەزل نەزانی دەبێتە بەشێکی دانەبڕاو لە سروشتیان، لەنێو خۆیاندا دەیبەخشنەوە، بۆیە هیچ جێگایەك بۆ خۆبەزلزانی نامێنێت لە ژیانیاندا، کەواتە هیچ جێگەیەك بۆ خیلاف و دووبەرەکیش نامێنێت، وەك خودا وەسفی کردون لە

قورئاندا: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ {المائده: ٥٤}، واته: (ئەو موسوڵمانەی ئیمانیان هێناوە لەگەڵ پێغەمبەردا خۆیان بە زەلیل و ملکەچ دادەنێن لە بەرامبەر موسوڵماناندا)، هەروەها وەك چۆن وەسیەتی کردووە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر): ﴿وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ {الحجر: ٨٨} واتە: (باڵی میهرەبانیت کەچ بکە بۆ موسوڵمانان)، ئەگەر ئەمەمان بەم شێوەیە ئەنجامدا، ئەوە هەنگاوە سەرەتاییەکانمان ناوە بۆ چوونە ناو ئاوە هەرێمیەکان (المیاه الإقلیمیة)ی شارستانیەت. کاتێك دەچینە مزگەوتەوە، دێتەوە بیرمان کە ئێمە دەچینە قوتابخانەی سوژدە و کڕنووشەوە، دەچینە قوتابخانەی ملکەچی و زەلیلی و خۆبەکەمزانین و نەرمونیانی لەگەڵ موسوڵمانان، ئێمە دەچینە مزگەوتێکەوە کە کۆمان دەکاتەوە و یەکسانمان دەکات و لەبەرامبەر یەکتری دڵەکانمان یەکدەخات و ڕق و کینە و دووبەرەکی لە دەروونماندا هەڵدەگرێ، بۆیە لە مزگەوتدا ڕاجیایی و ڕق و کینە، گەورە و بچووکی، کەسانی مەزن و کەسانی کەم و ئەمیر و فەقیر، ستەمکار و ستەملێکراو... نیە، هەرکەس دێتە مزگەوت پێی دەوترێ:

- پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) دەفەرموێت: ((أَقِيمُوا الصُّفُوفَ فَإِنَّمَا تَصُفُّونَ بِصُفُوفِ الْمَلاَئِكَةِ، وَحَاذُوا بين الْمَنَاكِبِ، وَسُدُّوا الْخَلَلَ، وَلِينُوا في أيدي إِخْوَانِكُمْ، وَلاَ تَذَرُوا فُرُجَاتٍ لِلشَّيْطَانِ، وَمَنْ وَصَلَ صَفًّا وَصَلَهُ الله – تَبَارَكَ وَتَعَالَى –، وَمَنْ قَطَعَ صَفًّا قَطَعَهُ الله)). *{صححه الألباني في صحيح الجامع، عن ابن عمر}* . واتە: (ڕیز بگرن و ڕیزەکانتان ڕێك بخەن وەك ڕیزی مەلائیکەکان، ڕیز ببەستن شانتان لەگەڵ شانی هاوڕێکانتان یەکبخەن و کەلێنەکان پڕبکەنەوە، بەنەرمی دەستی یەکتر ڕاکێشن بۆ ناو ڕیزەکان یان بۆ چوونە پێش یان دوا، بۆ ڕێکخستنی ڕیز، کەلێن مەهێڵنەوە بۆ شەیتان، هەرکەسێك ڕیزێك بەیەك بگەیەنێت خودای گەورە دەیگەیەنێت بە خۆی، هەرکەسێك ڕیزێك بپچڕێنێت خودای گەورە دای دەبڕێت لە خۆی).

الله.. چەند جار ئەم وەسیەتە پیرۆز و نەرمونیانەی پێغەمبەری خودامان خوێندۆتەوە، یان گوێمان لێبووە لە مەوعیزە و ئامۆژگاریەکان لە وتاری هەینیەکاندا، چەند جار ئیمامی مزگەوت دوبارەی کردۆتەوە بۆمان لەکاتی نوێژدا، بەڵام ئایا کاممان هەڵوێستەیەکی کردووە و ورد بۆتەوە لە وشە بە وشەی ئەم دەقە و مانا و ئامانجەکانی پشتی و حیکمەتەکانی بەهەند وەرگرتووە، ئەوەی ئەم کارە بکات بۆی دەردەکەوێت کە ئەم فەرموودەیە تەنها بنەمایەك نیە بۆ ڕێکخستنی ڕیزی نوێژەکان، بەڵکو دەستوورێکە بۆ ڕێکخستنی دەروونەکان، یاسایەکی تەواوە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی شارستانی یەکسان کەس خۆی بە بەرزتر نەزانێت لەوی تر لە سایەیدا.

لە سەرەتای ڕاڤەی فەرموودەکەدا دەپرسین بۆچی ئەم ئامۆژگاریانەی سەبارەت بە ڕێکخستنی نوێژ بەم شێوەیەیە: بۆ فەرمان دەکات (أقيموا الصفوف)، و (حاذو بين المناكب)؟ ئەم هەموو گرنگیە بۆ ڕێکخستنی ڕیزی نوێژ و یەکسانکردنی شان و پێیەکان بۆ؟ لە وەڵامدا زۆر بەسادەیی دەتوانین بڵێین: چونکە شارستانیەت لێرەوە دەستپێدەکات، بەڕاستی ئەمەش تۆوێکە لە تۆوەکانی شارستانیەت.

تۆ **یەکەم**: بانگهێشتکراوی بۆ ئامادەبوون بۆ ئەم چاوپێکەوتنە جەماعیەی لە نوێژدا، چونکە شارستانیەت کارێکی جەماعیە و فەردی نییە، ئەم کارە هەستکردنە بە ڕۆحیەتی یەك گرووپی و وازهێنانە لە خودپەرستی و خودویستی، شارستانیەت یەکەم بریتیە لە کارێکی جەماعی.

**دووەم**: تۆ بانگهێشتکراوی بۆ پەیوەستبوون بە کاتێکی دیاریکراو، ڕۆژی یەکجار نا، بەڵکو لە ڕۆژێکدا پێنج جار بۆ ئەوەی بە براکانت بگەیت و بەهۆیەوە رۆحیەتی وردی و پەیوەستی و وەفاکردن بە وەعد و بەڵێنەکانت لە ڕەگەکانتدا بچەسپێت، ببێتە بەشێك لە ڕەوشتی ڕۆژانەت بەشێوەیەك نەتوانی لێی لا بدەیت، کەواتە شارستانیەت بریتیە لە وردی و پەیوەستبوون و رێزگرتن لە کاتەکانمان و کاتی

ئەوانی تر.

**سێیەم:** تۆ لەم بەیەکگەیشتنەدا بانگهێشتکراوی بۆ ڕیزبەستن لەگەڵ ئەندامەکانی تری کۆمەڵی نوێژخوێنان، چونکە ڕێکوپێکی و ڕێك وەستانتان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕەنگ دەداتەوە لەسەر ڕێکبوونی دڵ و دەروونی هەمووتان بەیەکەوە، ڕێکبوونی زیهن و ئەندێشەتان بەیەکەوە، وردەکاری لە کارەکانتاندا، بەیەکگەیشتنی دڵەکانتان، بۆ ئەوەی بەهۆی هەموو ئەم کارانە کۆمەڵگەیەکی سەرکەوتوو و هاوکار و تەواو شارستانی بێتە ئاراوە، شارستانی کارێکی جەماعی و تەواوکاری و ڕێکخراو و ئارام و ملکەچ و یەکتر قبوڵکەرە، بەیەکگەیشتنە لەسەر ئەو هۆکار و ئامانجەکان و دڵ و دەروون و ڕۆحەکان، چوارەم و پێنجەم و ... دەیەم و چەندین حیکمەت و ئامانجی جوانتر هەن لەم بوارەدا.

پاشان خودای گەورە وازناهێنێت بەوەی ئەم بنەمایە بەجێبهێڵێت لە بەردەستمان تا لاوازیی و پاشخستنمان و نەخۆشی و کەموکوڕیە مرۆڤییەکانمان بەئارەزووی خۆی یاری پێبکات، بەڵکو ڕاستەوخۆ پەیوەستی دەکات بە ئاسمانەوە تاوەکو هیچ یەکێکمان بیر لە پشتهەڵکردن لێی یان شێواندن و دەستکاریکردنی نەکاتەوە، بیر بکەنەوە ئەی ئەو کەسانەی کە لەبەردەم خودای گەورەدا وەستاون ئەم ریزانەتان لە نوێژەکاندا لەسەر زەوی وێنەی ریزەکانی مەلائیکەکانە لەوێ لە ئاسمان (فإِنَّما تَصِفون بِصفُوفِ المَلائِكَةِ)، واتە: (هاوشێوەی ڕیزەکانی فریشتەکان ریز دەبن)، بەڕاستی ئەمە پەیوەستبوونێکی سەیر و کاربەجێیانەیە لەنێوان مەرجەکانی شارستانییەت و پایەکانیدا لەسەر زەوی لەگەڵ ئەوەی کە ڕوودەدات و لەسەری بونیات دەکرێت لەوێ لە ئاسمان، بەڕاستی ئەم فەرموودەیە زۆر بەکورتی پێمان دەڵێت: پەرستشی تەواو بریتیە لە شارستانیەتی تەواو، وەك چۆن لە ئاسمان ئەنجام دەدرێت لەلایەن مەلائیکەوە دەبێت بەو شێوەیە لەسەر زەویش ئەنجام بدرێت لەلایەن مرۆڤەکانەوە.

پاشان له دوای هەموو ئەمانه تۆ بانگکراوی بۆ پەیوەستبوون به مەرجێکی ترەوە: (سُدُّو الخَلَل .. لا تَذَروا فُرُجاتٍ لِلشَّيطان) بەڕاستی ئەمه بەرپرسیارێتی تاکه کەسه له بنیاتنانی شارستانیەت. هەریەکەمان دەبێت کەلێنێك له کەلێنەکانی ئوممەتەکەمان پڕبکەینەوە، هەریەکه بەپێی تایبەتمەندی خۆی، هەرکەسەو بەپێی بەرپرسیارێتی تاکه کەسی خۆی و بەپێی لێهاتوویی و شارەزایی تایبەتی خۆی له بنیاتنانی شارستانیەتەکەی خۆیدا، بۆیه هەرکەسێك واز لەو بەرپرسیاریەته بهێنێت ئەوە مانای هێشتنەوەی کەلێنه بۆ شەیتان، پاشان خیانەت و کەمتەرخەمی و سەرشۆڕی و کەلێن دروستکردنه لەم باڵەخانەیەدا که ئوممەت لێیەوە بەهرەمەند دەبن، شارستانیەت تایبەتمەندی و بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و یەکڕیزی و بنیاتنانه.

جارێکی تر خودای گەورە ئەم بنەما زەمینیه پەیوەست دەکاتەوە به ئاسمانەوە و پێمان دەڵێت: ئەی بەندەکەم خۆت بپارێزە، تۆ ئەگەر ڕیزەکان بەیەك بگەیەنیت ئەوا من له ئاسمانەوە دەتگەیەنمه ئامانج، ئەگەر ڕیزەکان بپچڕێنی ئەوا پەیوەندی به منەوە دەپچڕێنیت، وەك له فەرمودەکەدا هاتووە:

((مَنْ وَصَلَ صَفاً وَصَلَهُ اللهُ وَمَن قَطَعَ صَفاً قَطَعَهُ اللهُ عَزّوَجَلّ)).

واته: (هەرکەسێك ڕیزێك بەیەك بگەیەنێت خودای گەورە دەیگەیەنێت بەخۆی، هەرکەسێك ڕیزێك بپچڕێنێت خودای گەورە دای دەبڕێت له خۆی)، کەواته چ پەیوەستبوونێك لەو پەیوەستبوونه ڕوونتره له نێوان مەرجه شارستانییەکان لێره لەسەر زەوی لەگەڵ ئەوەی ڕوودەدات لەوێ له ئاسمان، بەڕاستی ئەوە پەیوەستبوونه له نێوان مەرجەکانی پەرستش و مەرجەکانی شارستانیەت.

پاشان لەسەرو هەموو ئەمانەوە تۆ بانگهێشتکراوی بۆ وازهێنان له مامەڵەکردن بەڕەقی لەگەڵ براکانت له نوێژدا، لەکۆمەڵگادا، له ژیاندا، وەك له فەرموودەکەدا هاتووە (ولينوا بأيدى اخوانكم). واته: (بەنەرمی دەستی یەکتر ڕاکێشن بۆ ناو

ڕیزەکان، یان بۆ چوونە پێش، یان دوا، بۆ ڕێکخستنی ڕیز)، چونکە نەرمونیانی شانەکان و پێیەکان لە نوێژدا لەتەنیشت هاوڕێکانمان کاتێك دەمانەوێت ڕیزەکانمان ڕێك بخەین بۆ پێشەوە بێت، یان بۆ دواوە، یان پڕکردنەوەی کەلێنێك، ئەمە کاریگەریی دروست دەکات لەسەر دڵ و دەروون و هەڵسوکەوتمان، وامان لێدەکات کە ڕەق نەبین لەگەڵ ئەوانی تر و توند و زبر و پەڕگیر نەبین لە بیرکردنەوە و بەڕێکردنی کاروبارەکانمان، مامەڵەمان لەگەڵ ئەوانەی ڕاجیان لەگەڵمان لە شێوازی بیرکردنەوەیان، تەنانەت لەگەڵ ئەوانەی لە بیروباوەڕیشمان لێك جیاوازین، ئەمە هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خودا بوو (دروودی خودای لەسەر بێت) لە درێژەی ژیانی ڕۆژانەیدا نەرمونیانی پیشەی ڕۆژانەی بووە وەك دایکی موسڵمانان بۆمان دەگێڕێتەوە:

ـ ((.. ما ضَرَبَ خادِمًا قَطُّ ولا امرأة، ولا ضَرَبَ رسُولُ اللّهِ ـ صلى الله عليه وسلم– بِيَدِهِ شَيئًا قط، إلا أَنْ يُجاهِدَ فِي سَبيلِ اللهِ، ولا خُيِّرَ بَين أَمْرَينِ الا كان أَحَبُّهُما إِلَيهِ أَيْسَرَهُما، إلا أَنْ يَكُونَ إِثْمًا، فَإذا كانَ إِثمًا كانَ أَبْعَدَ النّاسِ مِنَ الإثم، ولا انتَقَمَ لِنَفْسه مِنْ شَيءٍ يُؤتى اليه– أي يُوَجّهُ إِلَيْهِ– حَتى تُنْتَهِكَ حُرُماتُ اللهِ عَزّ وَجَلّ فَيَكُونُ هُوَ يَنْتَقِمُ لِلهِ عَزّ وجَلّ)). *{صححه الألباني في السلسلة الصحيحة}*

واتە: (پێغەمبەری خودا – درودی خودای لەسەر – هیچکات لە خزمەتکار و ئافرەتی نەداوە، بە دەستەکانی لە هیچ شتێکی نەداوە تەنها لە جیهاددا نەبێت، لەنێوان دوو شتدا ئەگەر بژاردەی تێدا بووبێت هەمیشە ئاسانەکەیانی هەڵبژاردووە و لەلای خۆشتر بووە بەمەرجێك تاوان نەبووبێت، ئەگەر تاوان بووبێت ئەو دوورترین کەس بووە لە تاوان، هیچ کات پێغەمبەری خودا –درودی خودای لەسەر – لەبەر خۆی تۆڵەی لە کەس نەکردۆتەوە مەگەر سنوورەکانی خودا بەزێنرابێت ئەو کات لەبەر خودا تۆڵەی سەندۆتەوە نەك لەبەر خۆی).

پاك و بێگەردی بۆ خودا، بڕوانن پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر

بێت) چەند سوور بووە لەسەر ئەوەی کە سادە و خاکی بین، کەچی ئێمە لوتبەرزی دەکەین، چەند سوور بووە لەسەر ئەوەی نەرمونیان بین، کەچی ئێمە بەڕقینەوە لەگەڵ یەکتر مامەڵە دەکەین، چەند سوور بووە لەسەر ئەوەی میانڕەو و لێبوردە بین، کەچی توند و پەڕگیرین، چەند سوور بووە لەسەر ئەوەی گوێ لەیەك بگرین و لەیەك حاڵی بین و لە یەکتر نزیك ببینەوە، کەچی لە یەکتر دوور دەکەوینەوە، ڕاجیا دەبین لەگەڵ یەکتر، چەند سوور بووە لەسەر ئەوەی کۆ بین و یەکگرتووبین و بەهێز بین، کەچی ڕاجیاو دووبەرەکیمان هەیە و لاوازین.

موسوڵمانان لەسەر زۆر شتی تەفصیلی راجیا بوون بەسەر ئەهلی سوننە و شیعەدا، بەڵام بەدرێژایی مێژوو و جیاوازی شوێنەکان کۆکبوون لەسەر ڕوکنەکانی نوێژ و بنەماکانیان و ژمارەکانیان و هەستان و دانیشتن و کاتەکانیان هۆکاری ئەمەش ئەو شێوازە بەیەکەوەبوونەیە کە لە نوێژی جەماعەتدا هەیە.

بونیادی زۆرێك لە پەرستشەکانمان بەیەکەوە ئەنجامدانیان پاراستوونی لەهەر گۆڕانکاری و زیاد و کەمکردنێك.

ئەوەتا هەموو موسڵمانان یەکڕان لەسەر دەقەکانی قورئان، چونکە ئیسلام واجبی کردووە لەسەریان کە بەیەکەوە بیخوێنن و گوێی لێبگرن و بەبەردەوامی ڕۆژانە سێ جار لە نوێژە بەدەنگەکانەوە (ئێوارە و خەوتنان و بەیانی) ئەمە ئەنجام دەدرێت لە هەموو مزگەوتێك لە هەر وڵاتێك و شار و گوندێك بێت، پێشنوێژ قورئانەکە دەخوێنێت، نوێژخوێنانیش لەدوایەوە گوێدەگرن و ورد دەبنەوە لێی و تۆماری دەکەن لە دڵ و دەروونیاندا، بەڵام موسوڵمانان ڕاجیاییان بۆ دروست بووە لەسەر ڕاڤەکردنی هەندێك لە دەقەکانی قورئان، چونکە ڕاڤەکردن کارێکی جەماعی نیە، ڕاجیانین لەسەر ڕوکاری نوێژ، چونکە کارێکی جەماعیە و لە مزگەوتەکاندا تۆمار دەکرێت و ئەنجام دەدرێت ڕۆژانە پێنج جار، بەڵام ڕاجیان لەسەر ئەوەی یەکەمجار لەم نوێژانەدا دڵەکانیان ڕوو بکەنە کێ، چونکە چاودێر لەسەر دڵەکان نیە

تەنها خودای گەورە نەبێت، هەروەها ڕاجیا نەبوون لەسەر ڕووکەشی حەجی ماڵی خودا و بنەما سەرەکیەکانی، چونکە پەرستشێکی جەماعیە و لەژێر چاودێری و تۆماری کۆمەڵی حەجکەران ئەنجام دەدرێت، بەڵام لەسەر هەندێك بنەما و وردەکاری لەم پەرستشەدا ناکۆك بوون ئەگەر لە گەلانی سەرزەوی ئەمڕۆ بڕوانین و بمانەوێت جیاکاری بکەین لەنێوان ئەوانەی پێشکەوتوون و ئەوانەی دواکەوتوون و گرنگترین ڕەوشت و سیفەتەکانی هەریەکەیان دیاری بکەین دەبینین ئەو گەلانەی شارستانیەتیان بنیاتناوە و پێشکەوتوون ئەوا لەنێو خۆیاندا خاکی بوون و لێبوردە و کۆك و یەکگرتوو بوون و تایبەتمەندییان وەرگرتووە لە زانستەکاندا، کاریان کردووە بۆ بنیاتنانی وڵاتەکانیان وەك یەك گرووپ، یەکدەستە و یەك دڵ بە هیمەتێکی بەرز و ویستێکی بەهێزەوە کاریان کردووە، ئەو گەلانەشی کەوا دواکەوتوون ئەوا لوتبەرز و خۆبەزلزان بوون لە ناو یەکتریدا و توونددئاژۆ و تەمبەڵ و کەمتەرخەم و پارچەپارچە بوون و یەکتریان قبوڵ نەکردووە و پارچەپارچە هەریەکە و بەلایەکدا لاڕێ بوون ئەگەر دوو پارچەیان هاوڕابوون ئەوە لەسەر دوژمنایەتی و شەڕکردن لەگەڵ پارچەی سێیەم یەکبوون. بەداخەوە ئایا ئەمە حاڵی گەلانی موسڵمان نیە لە زۆربەی حاڵەت و وڵاتەکانیاندا؟

ئەگەر هەریەکەمان ئەم فەرموودەیەمان لەبەرچاو گرتبا، پاشان لە وشەکانی ورد بوبباینەوە و لەسەر خۆمان و کەسوکاری چواردەوری خۆمان جێبەجێمان کردبا ئەو نهێنیەمان بۆ ڕوون دەبووەوە کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێت) کاتێك زۆر جەختی کردۆتەوە لەسەر ئەنجامدانی پەرستشەکان بەتایبەتی نوێژ بە کۆ و جەماعەت ئامانج لێی: یەکگرتویی و بەهێزی و یەکیەتی نێو موسوڵمانانە، ئەگەرنا ئەوە وەك مەڕی هەڵبڕاو لە مێگەل دەبنە نێچیری گورگەکان، ئای چەندە گەلە گورگی زۆرهەن لە چواردەورمان لەم جیهانەدا.

ـ ((ما مِنْ ثَلاثَةٍ في قَريَة ولا بَدوٍ لا تُقامُ فِيهمُ الصَّلاةُ الا وقَد استَحوَذَ عَلَيهمُ

الشَّيطان، فَعَلَيكَ بِالجَماعَةِ فَانَّما يَأكُلُ الذِّئبُ القاصِيَةَ)) – أي المنفردة من الغنم عن قطيها–. {رواه أبو دود عن أبي درداء} . واته: (هیچ کاتێك سێ کەس لە دێیەکدا، یان بادییەیەکدا نابن و نوێژی جەماعەت ئەنجام نادرێ لە ناویاندا، ئیللا شەیتان زاڵ دەبێت بەسەریاندا، بۆیە لەگەڵ کۆمەڵی موسوڵمانادا بە، چونکە گورگ ئەو مەڕە دەخوات کە هەڵبڕاوە لە هاوڕێکانی).

کاتێك دڵەکان کۆدەبنەوە لە نوێژی جەماعەتدا ـ نەك تەنها لاشەکان ـ پێویستە لە دوایدا ئەم کۆبوونەوەیە ڕەنگبداتەوە لەسەر تەواوی ژیانمان و بیرکردنەوەمان، وامان لێبێت بەکۆمەڵ هەڵسوکەوت بکەین و هەموومان بەکۆمەڵ بیر بکەینەوە و بەکۆمەڵ کار بکەین و بەکۆمەڵ بنیات بنێین و بەکۆمەڵ دڵخۆش بین و بەکۆمەڵ دڵتەنگ بین، تەنها بەم شێوەیە کۆمەڵگەی موسوڵمانان لە دواکەوتوویی و داڕوخاوی شارستانیەکەیانەوە گۆڕان بۆ شارستانیەتی جوانی ئیسلام، بە بەها و ڕەوشتە بەرزەکانیان و بە فیکر و زانست و یەکپارچەیی خاکەکەیی و یەکبوونی نەوەکانی، بۆیە زەوی و ئاسمانیان بەیەکەوە کۆکردەوە ئەو کاتەی کە یەکپارچەیی و یەك کۆمەڵی و یەك بەهەشتی کۆبوویەوە لەلایان.

ـ ((عَلَيكُم بِالجَماعَةِ وإيّاكُم الفُرقَةَ، فإنَّ الشَّيطانَ مَع الواحدِ وهُو منَ الإثنَينِ أبعَد، ومَنَ أرادَ بُحْبُحَة الجَنَّةِ فَعَليهِ بِالجَماَعةِ)) {صححه الألباني عن عمر بن الخطاب} .

واتة: (لەگەڵ کۆمەڵی موسوڵمانانندا بن، خۆتان بپارێزن لە دووبەرەکی، شەیتان لەگەڵ یەك تاقە کەسدایە و لە دوو کەس دوورترە، ئەوەی ناوجەرگەی بەهەشتی دەوێت با لەگەڵ کۆمەڵی موسوڵمانانندا بێت).

شارستانیەت کۆکبوون و تەواوکاری و یەکڕیزی ورەردەکاری و خاکی بوون و نەرمونیانی و قبوڵکردنی بەرامبەر و نزیکبوونەوە و هیمەتبەرزی و ئیرادە و ئارامگریە.

## وتاری هەینی: خولی گەشەپێدان و پێشکەوتن

لە یەکێك لە مزگەوتەکانی شاری (ئۆکسفۆرد) کەوتنە دەنگە دەنگ کاتێك وتارخوێنی هەینیەکەیان وتارەکەی تەواو کرد بە زمانی ئینگلیزی و هیچ وشەیەکی زمانی عەرەبی لە وتارەکەیدا بەکارنەهێنا، دەیانگوت وتاری مامۆستا تەواو نییە، چونکە بە زمانێکی جیاواز لە زمانی عەرەبی پێشکەشی کرد، نوێژی هەینی هیچی قبولّ نییە ئەگەر وتارەکە بە زمانی عەرەبی نەبێت.

ئێمە لە بەریتانیا زۆرجار بەسەرسوڕمانیەوە دەڕوانینە ئەم جۆرە ڕووداوانە، سەرسوڕمانیەك کە پێزانین لەخۆی دەگرێت لە بەرامبەر هەندێك لەو برایانەمان کە بە زمانی عەرەبی نادوێن کاتێك دەیانبینین کە ڕێزی تایبەت و پیرۆزی و خۆشەویستی لە بەرامبەر ئەم زمانەدا دەنوێنن کە ئێمە ئەوەمان لەدەستداوە، ئەمجۆرە ڕێزە وامان لێدەکات هەست بە تەریقی بکەین تۆزێك بمانهێنێتە تێگەیشتن و ڕوشد، هانمان دەدات لەسەر خۆداماڵین لەو ڕاهاتنە نەرێنیە کوشندەیەی کە لەسەری ڕاهاتووین، لە مامەڵەکردن لەگەڵ زمانەکەمان بۆ ڕێزگرتن و خۆشەویستی بۆی، یارمەتیمان دەدات لەسەر دووبارە دۆزینەوەی و دۆزینەوەی بەها و پێگە و پیرۆزیەکەی.

بەڕاستی ئەمە ڕوویەکی پرشنگدارە لەلایەن ئەو برایانەمان، ئێمەی عەرەب وا لێدەکات هەست بە تاوان بکەین، ئەو واجبە پیرۆزەمان بیردەخاتەوە کە لە بیرمان کردووە بەرامبەر زمانی دایکمان، بەڵام بۆ ئەم وێنایەش ڕوویەکی جیاوازی تر هەیە.

لەوکاتەدا ئەو برایانەمان دەبینین جەخت دەکەنەوە لەسەر ئەوەی کە دەبێت وتاری هەینی بە زمانی عەرەبی بێت و هیچ زمانێکی تر نەبێت، ئەگەر تێشی نەگەن، ئەو چەمك و دەستەواژە شێوێنراوانە دەردەکەون و دێنە بەردەممان بەئاشکرا، کە لەلای هەندێك موسڵمان هەیە بۆ ئەو ڕۆڵە سەرەکی و زیندووەی کە وتاری هەینی بۆ دانراوە، هەروەها ئەو جیاکردنەوە ترسناکە لەنێوان ئاین و ژیانمان

بۆ روون دەبێتەوە، وەك هەندێك دەڵێن: وتارەکە با لە قورئان و فەرموودە دەرنەچێت! ئەوی تر گرنگ نییە چی دەڵێت یان نایڵێت، پێنج نوێژە فەرزەکان ئەنجام بدە دوایی کێشە نییە دزیت کرد، یان خەڵکت هەڵخەڵەتاند، یان درۆت کرد، یان زینات ئەنجامدا، گۆشتی بەراز مەخۆ گۆشتی حەڵاڵ بخۆ دوایی کێشە نییە هەرچەند تاوان ئەنجام بدەیت.. بەم شێوەیە وێنای ئیسلام رۆژانە دەشێوێنرێت لەبەرچاوی رۆژئاوا بەقەدەر تێنەگەیشتنی موسوڵمانان لەم ئیسلامە لە روویەکەوە و بەقەدەر جەختکردنەوە لەسەر وردەکارییەکان و شتە لاوەکیەکان و رووکەشەکان و وەلانانی پایە و بنەما سەرەکییەکان لەلایەکی ترەوە، ئای چەندە ستەم لە ئیسلام دەکرێت بەهۆی نەزانیی موسوڵمانان خۆیانەوە، ئای چەندە بەڵا بەسەر ئیسلام و پەیام و خەڵکەکەیدا دەهێنرێت بە دەستی موسوڵمانان خۆیان؟

براکانمان بەمەرجیان گرتووە لەسەر ئیمام کە وتاری هەینییەکەی بە زمانی عەرەبی بێت نەك بە زمانە لۆکاڵییەکەی خۆیان، یان هەر زمانێکی بێگانەی تر کە تێی بگەن، رەنگە ئەو وتارە لە چەند ئایەت و فەرموودەیەك تێنەپەڕێت، رەنگە وتاربێژەکە چەند وشەیەك و چەند حیکمەتی گێڕدراوە زیاد بکات کە بووە بە عادەت هەموو هەینییەك دوبارەیان دەکاتەوە لە بەردەمیاندا، پاشان دەبینین خەڵك چۆن چوون بۆ مزگەوت ئاواش دێنەدەر، هیچی تازە نییە، هیچ تێنەگەیشتوون، هیچ ئامۆژگاری فێر نەبوون، هیچ یادکرنەوەیەك، هیچ رێنماییەك لەبارەی حوکمە شەرعییەکان و چارەسەری پێشهاتەکانیان دەست نەکەوتووە، ئا بەم شێوەیە رۆحی وتاری ئاینی دەکوژین، تەنها لاشە و روکەشە زمانەوانییەکەی دەهێڵینەوە. ئێمە ئەم روونکردنەوە هەفتانەییە گرنگانە لە مەبەستەکەی دادەماڵین، بە هەندێك هەڵسوکەوت و رووکەشی جوڵەیی و وشەیی پەرستشەکان، یاسا و رێساکانیان دەگۆڕین رێك وەك ئەوەی کە زۆرێك لە موسوڵمانان پەرستشەکانی تریان لە مانا کردارییەکانی داماڵیوە کاتێك جیایان دەکەنەوە لە

ژیان، دەبینین نوێژ دەکەن و دزیش دەکەن و بەڕۆژووش دەبن و درۆش دەکەن و سنوورەکانی شەرع دەبەزێنن و هەموو ئەو تاوانانە ئەنجام دەدەن کە خوویان پێوە گرتووە، بۆ ئەوەی ئەو جیاکارییە سەیرە لە نێوان ئاین و دنیاکەیاندا بچەسپێنن.

دەبینی هەندێکیان لەسەرو نەخوێندەواری خۆیەوە وانەیەکت پێدەڵێت لەسەر پێویستی رەچاوکردنی مەرجەکانی گۆشتی حەڵاڵ ئەگەرچی رەنگە بۆچوونەکەی تۆ جیاواز بێت لەوبارەیەوە، کەچی دەبینیت لە پەنهانیدا –یان بەئاشکراش هەندێکجار– کەسێکی فێڵباز و ساختەچی و پیلانگێڕ و هەڵخەڵەتێنەر و درۆزن و دز و ئازاردەر شایەتدەر بە ناڕاست و خۆدزەرەوە لە یاسا، رەنگە موعتادیش بێت، لە بەرگی موسوڵمانێکی پابەندا خۆی شاردۆتەوە، هەمیشە جەخت دەکاتەوە کە ئەو موسڵمانێکی راستەقینەیە و ئەگەر بە بۆچوون و تێگەیشتن و مەرجەکانی ئەو رازی نەبیت لە بارەی گۆشتی حەڵاڵەوە ئەوە رەنگە دەرتبهێنێت لە میللەتی ئیسلام.

بەشێکی زۆری موسوڵمانان بەمشێوەیەیان لێهاتووە: نوێژ بکە دوایی چی دەکەیت بیکە، هەرچی دەڵێیت لە وتارەکەتدا بەس با عەرەبی بێت، ئەوەی دەتەوێت ئەنجامی بدە لە ژیان و مامەڵەت لەگەڵ خەڵکدا، گرنگ ئەوەیە تەنها گۆشتی حەڵاڵ بخۆی –جا بەو تێگەیشتنە ناوچەییەی خۆشی بۆ ئەم مەسەلەیە–.

زۆرێك رۆڵی سەرەکی وتاری هەینی لە ژیانی کۆمەڵگای ئیسلامی و گەشەسەندن و پێشکەوتنی نازانن، بۆیە نوێژی هەینی و وتارەکەیان بەسەردا تێدەپەڕێت، وا سەیری دەکەن کە پەرستشێکی رووکەشە، دەبێت ئەنجامی بدەن، پێویستە ئەنجامی بدەن و لەسەر شانی خۆیانی رابکەن بەوەی لەکاتی خۆیدا ئامادەبن و بێدەنگ بن بۆ وتارخوێنەکە و بەرێکی رابوەستن و نوێژەکەیان ئەنجام بدەن، سەلام بدەنەوە: السلام علیکم ورحمة الله، السلام علیکم ورحمة الله.

پێویستە بپرسین لەبەردەم ئەم حاڵەتەدا: باشە کاتێك بێدەنگی لە بەردەم وتارخوێندا تەشریعکراوە، ئارامیی و لەسەرخۆیی پێویستکراوە لە کاتی

وتارخوێندنەوەدا تەنها لەبەر رێزگرتن نییە بۆ وتارخوێنەکە؟ باشە وتاری هەینی بەم دابڕینە لە رۆحەکەی تەنها مەراسیمێکی رووکەش و کۆمەڵێك جووڵە و وەرزشی لاشەیی و فیزیایی نییە و ناوەڕۆکەکەی هیچ سوود و مانایەکی نییە؟

لەراستیدا نوێژی هەینی پەرستشە، وتارەکەشی پلانی کردارییە، ئەم وتارە بەشێکی دانەبڕاوە لە نوێژی هەینی، بەشێوەیەك لە هەندێ فەرموودەدا هاتووە: ئەوەی وتارەکەی لەکیس بچێت وەك ئەوە وایە نوێژەکەی لەکیس چووبێت.

- ((إنَّ الملائِكةَ يَومَ الجُمعةِ عَلى أبوابِ المَساجدِ، يَكتُبون النّاسَ عَلى مَنازِلهِم، جاءَ فُلانٌ، والإِمامُ يَخطُبُ، جاءَ فُلانٌ فأَدرَكَ الصَّلاةَ ولَم يُدرِكْ الجُمعَةَ إِذا لَم يُدرِكْ الجُمُعَةَ)) *{رواه أحمد عن أبي هريرة}*.

واتە: (فریشتەکان رۆژانی هەینی لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکان دەوەستن بەپێی پلەوپایەکان خەڵکی دەنوسن، فلان کەس لە فلان کاتدا هاتووە، فلان کەس لە فلان کاتدا هاتووە، فلان کەس کاتێك هات ئیمام وتاری دەخوێندەوە، فلان کەس هات فریای نوێژ کەوت، بەڵام فریای وتارەکە نەکەوت).

بۆیە لەسەر پێشنوێژ پێویستە کە وتارەکەی درێژ بکاتەوە بەپێی جۆری نوێژخوێنەکانی و ئاستی رۆشنبیرییان، سروشتی حاڵ و زروفیان و ئەو بابەتانەی گرنگی پێدەدەن، ئەگەر بیەوێت سوودیان پێبگەیەنێت و لە دوای دەرچوونیان لە مزگەوت بابەتەکانیان بیر بمێنێت و کاری لەسەر بکەن، بۆیە وتاردان بۆ کۆمەڵێك کرێکار دەبێت جیاواز بێت لە وتارێك کە لەبەردەم جەماوەرێکی رۆشنبیر دەدرێت، دەبێ ئەو وتارەی بەگوێی خوێندکارانی ناوەندیدا دەدرێت جیاواز بێت لەو وتارانەی بەگوێی خوێندکارانی زانکۆدا دەدرێت، یان بۆ مامۆستایانی زانکۆ دەدرێت، دەبێت وتار بۆ تازە موسڵمانبووەکان لە هەموویان جیاوازتر بێت.

پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) هیچ کات بەهۆی بۆنە، یان بەبێ هۆ ئایەتەکانی دووبارە نەکردۆتەوە وەك هەندێك لە وتارخوێنانی ئەمڕۆ ئەنجامی

دەدەن، کاتێك کە وتارەکەیان لە ئایەتێك یان چەند ئایەتێك، یان چەند فەرموودەیەکی دووبارە تێناپەڕێت، لەبەردەمماندا وەك تووتی دەیلێنەوە و چەند بارەی دەکەنەوە بەبێ ئەوەی هەوڵ بدەن جوان پەیوەستی بکەن بەوەی کە روودەدات لە واقیعدا لە رووی کات و شوێنەوە، بەڕاستی گوناهبار دەبین لەبەرامبەر ئەو ئایەتانەدا کە هەر ئەوانە چەندبارە دەکەینەوە و دەیاندەین بەگوێی خەڵکدا بەهۆی بۆنەیەك یان بەبێ هۆ، تا وایان لێدەکەین بێزار بن و پشتی تێبکەن و گوێی لێنەگرن، تەنانەت رەنگە بەهۆی ئەم کارەوە ئەو هەستەیان لەبەرامبەر هەموو قورئان بۆ دروستبێت. دەبێ کەی بێت ئەو رۆژەی کە زمانی وتاری هەینی ببێتە شتێکی لاوەکی و ناوەڕۆکەکەی بە ئامانج بگیرێت؟ دەبێ کەی بێت مەسەلەی گۆشتی حەڵاڵ و هاوشێوەکانی بابەتی بنیاتنەر نەبن بۆ رێنماییە ئایینی و رەوشتە بەرز و نەمرەکان؟ دەبێ کەی ژیانمان ببێتە بەرجەستە و جێبەجێکەر و پشتڕاستکەرەوەی پەرستش و بەها ئاینییەکان.

ئەگەر خودای گەورە سەرەتای هەر سەدەیەك نوێکەرەوەیەکی ئاین بنێرێت بۆ موسوڵمانان وەك لە فەرموودەکاندا پشتڕاستکراوەتەوە ئەوە رۆڵی وتاربێژی هەینی لە سەرەتای هەموو هەفتەیەکدا ئەوەیە کە حوکمەکانی ئاینەکەی بۆ نوێژخوێنان نوێ بکاتەوە و لەسەر درێژە و وردەکاریەکان و پێشهاتەکانی سەردەم هەڵوێستە بکات، بۆ ئەوەی رەوڕەوەی ژیاندا بڕۆن و پارێزگاری لە پەیوەستبوونیان پێوەی بکەن، بەشداری بکەن لە دروستکردن و گەشەسەندنی.

ئەگەر هەموو دامەزراوەیەك بەرنامەی هەفتەیی راهێنان و گەشەسەندنی ناچاری هەبێت کە بەسەر فەرمانبەرەکانیدا جێبەجێی بکات، ئەوە وتاری هەینیش ئەو بەرنامە راهێنان و رێنماییکەر و گەشەسەندە ناچارەییەیە بۆ ژیانی موسوڵمان، ئەو پەیوەستیە هەفتانەییە فەرمییە زانستییە رێنماییە رۆشنبیرییە راهێنانەییە پەروەردەکەرەیە لە نێوان دامەزراوەی ئیسلام و دامەزراوەی ژیان.

# لێرەوە دەست پێدەکەین

جارێك پرسیاری برایەکم کرد کە نوێژی دەکرد لەگەڵمان لە مزگەوت، پێیان وتم کە ماوەیەکە لەم مزگەوتەی ئێمە نوێژ ناکات، حەزی لە مزگەوتێکی ترە، چونکە لەگەڵ موسوڵمانێك کە دێت بۆ ئەم مزگەوتە ناخۆشییان هەیە، پاشان بە برایەکی تر گەشتم ماوەیەك بوو نەمبینی بوو، لێم پرسی: بۆ ناتبینم لە مزگەوتەکەمان؟ وتی من لە مزگەوتێك نوێژ ناکەم وتاربێژەکەی بچێتە سەر مینبەر و بڵێت مرۆڤ لە تنۆکە ئاوێکی بێڕێز دروست کراوە، چۆن دەوێرێت و ماف بەخۆی دەدات کە ئەو تنۆکە ئاوەی مرۆڤی لێ دروست بووە بە بێڕێز سەیری بکات، جارێکیتر بە هاوڕێیەکم گەشتم لە ڕێگای مزگەوت و دەستمان کرد بە قسەکردن هەتا گەشتینە بەردەرگای مزگەوت، کاتێك گەشتین خوا حافیزی لێ کردم، بەسەرسوڕمانەوە پێم وت ئەمە چییە نوێژ ناکەی لەگەڵمان؟ سەری بادا بەملاولادا و وتی من لە مزگەوتێك نوێژ ناکەم کە سەلەفی نوێژ بکەن تیایدا.

لێرەدا پرسیارم لە خۆم کرد: باشە بیهێنە بەرچاوت گەلی موسوڵمان ئەگەر دابەش بن بەسەر ئەم سێ تاقمەدا سێیەکیان لەو مزگەوتانە نوێژ ناکەن کە ناحەزەکانیان یان ئەو کەسانەی ناکۆکیان هەیە لەگەڵیان لەوێ نوێژ دەکەن، سێیەکی تریان لە وتاربێژی مزگەوت خۆش نابێت کە هەڵەیەکی کردووە لە وتارەکەیدا ئەگەر وادابنێین هەڵەیە، سێ یەکەکەی تر نایەوێ لە مزگەوتدا کۆببێتەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی ڕاجیان لەگەڵیان لە بۆچوون و ئیجتیهادەکاندا، باشە ئێوە لە گەلێکی وا ڕادەبینن و گومانتان هەیە کە بتوانێت و شایستە بێت بۆئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان حوکمی جیهان بکات چ جای حوکمی خۆی؟

باشە ئێمە چیمان لە ڕەوشتی مزگەوت کرد، چیمان لە مەرجەکانی نوێژی جەماعەت کرد و چیمان لە ڕۆڵە مێژووییە مەزنەکەی کرد، کە لێیەوە سوپا و هێزە مەزنەکانی ئیسلام دەرچون بۆ ئەوەی ئیسلام بڵاو بکەنەوە، شارستانییەتی ئیسلام

و ڕەوشتی ئیسلام لەسەر ڕووی زەوی پەخش بکەن لە ماوەیەکی کەمی دیاریکراودا، کە هیچ شارستانییەتێکی مرۆڤایەتی شتی وای بەخۆیەوە نەبینیوە و نابینێت، نە لە ڕابردوو نە لە داهاتوو.

لە نیسانی ساڵی ٢٠١٢دا داوام لێکرا بەشداری بکەم لە خولێك کە (دەزگای ئەکادیمی بانگخوازی هاوچەرخ — مؤسسة الداعية المعاصر) سازی کردبوو، ئامانج لێی دەرخستنی چەند نموونەیەکی سەرکەوتوو لە دەرچوانی کچ و کوڕی زانکۆی ئەزهەری پیرۆز، ئەوانەی لەڕووی زانستیی و هەڵسوکەوتەوە سەرکەوتوو بوون، بۆئەوەی بتوانن کۆنتاکت دروست بکەن لەگەڵ گەنجان و پەیامی ئیسلامی میانڕەوییان پێ بگەیەنن. بەو پێیەی کە شارەزاییم هەیە، نزیکەی ٢٠ ساڵ کارم کردووە وەك پشکنەر –مفتش– لە ئەنجومەنی بەریتانی بۆ دانپیانان بە زانکۆ و پەیمانگاکان:

(The British Accreditation council)

کە ئەم کۆڕبەندە ئێستا فراوانتر بووە بۆ ئەوەی زانکۆ و پەیمانگاکانی دەرەوەی بەریتانیاش بگرێتەوە، مانای وایە کە ئەم کۆڕبەندە شارەزایی و لێهاتوویی ئاستە شارستانییە بەریتانییەکان دەگوازێتەوە بۆ ئەو زانکۆیانە، هەر بۆیە من پێشنیارم کرد بۆ ئەو دەزگایەی کە بانگهێشتیان کردبووم کە هەستن بە دانانی کۆڕبەندێکی هاوشێوە کە من ناوم نابوو (ئەنجومەنی دانپیانانی ئیسلامی نێودەوڵەتی) (مجلس الاعتراف الاسلامی الدولی)، بەمەبەستی دۆزینەوەی خاڵی بەیەکگەیشتنی شارستانی کە بۆ مەرجەکانی ئەم ئەنجومەنە نوێیە ملکەچ ببێت لە تەواوی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا، لە میسرەوە دەست پێ بکات، ئەم خاڵی بەیەکگەیشتنانە تەنها زانکۆ و دەزگا پەروەردەییەکان نەگرێتەوە، بەڵکو هەموو دامەزراوەکانی دەوڵەت بگرێتەوە لە کۆمپانیا و بەڕێوەبەرایەتییە حکومییەکان و جادە و بان و گەڕەکە بچووکەکان و باڵەخانە نیشتەجێییەکان و خەستەخانە و عەیادە و قوتابخانە و

پەیمانگا و فرۆشگا و مزگەوت و کەنیسە و باخچە گشتییەکان و باخچەی منالآن و...هتد، ئەم پەنجا خوێندکارە بەشداربووە لە خولەکەدا ببنە تۆوی ئەم بیرۆکەیە بەشێوەیەك گرووپی بچووکی ناوچەیی دروست بکرێت و پەیوەستبن بەم ئەنجومەنی دانپیانانەدا کە باسمانکرد، پاشان ئەم ئەنجومەنە مەرج و ڕێنماییەکانی پەخش بکات بەسەر ئەو دەزگا و شوێنانەدا و ڕۆحی کێبڕکێی شارستانی و ئایینی دروست بکات کە هەوڵ بدەن دانپیانانی ئەم ئەنجومەنە بەدەست بێنن، بەم شێوەیە بە گرتنەبەری چەند ڕێکار و کێبڕکێ و پێشبڕکێی بەردەوام لەنێو ئەم دەزگایانەدا تا ئەو دەزگایانەی کە ناتوانن یان نەیانتوانیوە دانپیانانی ئەم ئەنجومەنە بەدەست بێنن هەست بکەن کە دابڕاون لە چواردەوری خۆیان.

پاشان ئەم شوێنانە مانگ بە مانگ و ساڵ بەساڵ زیاد دەبن بەهۆی بڵاوبوونەوەی کاریگەرییەکانیان لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ژیان لەسەر زەوی مصر، تا لە ماوەی ١٠ تا ٢٠ ساڵدا مصر لە ڕێگەی ئەم بەرنامەیەوە وایلێدێت دێتە ڕیزی دەوڵەتە ئەوروپییەکانەوە، لە ڕووی کارجوانی و ڕێکوپێکی و ڕێکخستن و پاکوخاوێنی و جوانی ئاکارییەوە، لە ڕووی بەرزبوونەوەی ئاستی وەبەرهێنان و ئاستی سەلامەتی گشتییەوە و لە ئاستی خوێندن و ئاستی پەروەردە و ئاستی هەڵسوکەوت، ئەمەش بەشێوەیەکی سروشتی دەیگێڕێتەوە بۆ بەها ئایینییە فەوتاوەکانی، لەڕاستیدا ئەم بیرۆکەیە نەهاتۆتەدەر و لەجێی خۆی ماوە لەسەر پەڕە و جێبەجێ نەکراوە، ئەمەش بەهۆی ئەو ڕووداوە نەخوازراو و یەك لە دوایەکانەی کە هاتن بەدوای ٢٥ی یەنایەردا، ئەمە وامان لێدەکات بە لایەکی تردا بیربکەینەوە: بۆچی ئەم جوڵانەوە گەورەیە لە بچووکترین یەکەی شارستانی بنیاتنانی دەوڵەتی ئیسلامییەوە دەست پێنەکەین و جێبەجێی نەکەین، ئەویش: مزگەوت و خەڵکی مزگەوتە، مزگەوت لە هەموو شارێك و لە هەموو گەڕەکێك و لە هەموو گوندێك هەیە، هەموو مزگەوتێك بە سەرپەرشتی پێشنوێژەکەی و هەندێك لە

نوێژخوێنانی گەنجی بوێر دەتوانێت ببێتە ئەنجومەنێکی دانپیانانی ناوچەیی بۆ هەموو ئەو دەزگایانەی کە لە چواردەوری هەن بە ڕەچاوکردنی ئەو بنەما شارستانیانەی کە باسمانکردن لە نوێژی جەماعەتدا.

ئەوەی ئەنجومەنی بەریتانی بۆ دانپیانان دەیەوێت لەو دەزگایانەی دانیان پێدا دەنێت ئەگەر تەجاوزی لە ئامانجەکەی بکەین کە گرنگی دەدات بە زانکۆکان چەند مەرجێکی سەرەکین:

– ڕووکەشی ناوەوە و دەرەوەی بینا.

– مەرجە تەندروستییەکان و پاکوخاوێنی و مەرجەکانی سەلامەتی بۆ ئەو کەسانەی کاردەکەن و سوود وەردەگرن لەم دەزگایانە.

– گونجاوی ئامادەگی بینا و نووسینگە و ژوورەکانی بۆ جۆری ئەو خزمەتگوزاریەی ئەو دەزگایە پێشکەشی دەکات.

– ئامادەکردنی تەواوی پێداویستییەکانی هەموو ئەو کەسانەی کار دەکەن و سودمەند دەبن لەو دەزگایە.

– ئاستی سەرکەوتوویی بەڕێوەبردن لەو دەزگایەدا لە ئاسانکردن و بەڕێکردنی کارەکان و بەدیهێنانی ئامانجەکانی.

– ئاستی لێهاتوویی ئەو کەسانەی کار دەکەن تیایدا و جۆری ئەو بڕوانامانەی کە هەیانە و تۆمارکردنی.

– بەردەوامبوون لە کردنەوەی خولی ڕاهێنان بۆ ئەوانەی کاردەکەن لەو دامەزراوەیەدا، لەگەڵ بوونی مووچەی دادپەروەرانە و یەکسان بۆیان.

– بوونی گرێبەستی یاسایی بۆ هەموو ئەوانەی کاردەکەن لەو دامەزراوەیەدا، لەگەڵ بوونی مووچەی دادپەروەرانە و یەکسان بۆیان.

– بوونی یاسایەك بۆ هاندان و دەستپێشخەرییە تاکییەکانی ئیشکەرەکان و گەشەپێدانی توانا و لێهاتووییەکانیان.

– بوونی ڕێکخستنێکی ورد و نویێ بۆ دۆسیە و مەلەفەکانی ئەو کەسانەی کاردەکەن و سودمەند دەبن لەو دامەزراوەیە.

– پێویستە دامەزراوەکە پارێزگاری بکات لە هەموو یاسا و پلانەکانی، ئەرك و کاری ئەوانەی کار دەکەن تیایدا بە نووسراو و ڕوونبێت.

– ڕاست و ڕەوانی ئەو بڵاوکراوە و بانگەوازانەی کە لەو دامەزراوەیەوە دەردەچێت.

– ڕاست و ڕەوانی ئەو خزمەتگوزاری و لێهاتوویی و بڕوانامانەی کە دامەزراوەکە بۆ خەڵکی فەراهەم دێنێ.

– زمانی ئاخاوتن لەگەڵ خەڵکانی تر، شارستانیەتی زمانی گووتاری نووسراو و شایستە و سەردەمیانە.

– گونجاوی و بەدەم هاتنی کارگێڕی دامەزراوەکە و ئەوانەی سوودمەند دەبن لێی، تا چەند پێداویستییەکانیان بۆ فەراهەم دێنێت.

– دادگەریی و یەکسانی لەنێوان کەسانی کارکەر لە دامەزراوەکە و ئەوانەی سوودمەند دەبن لێی و ئەنجامنەدانی جیاکاری دەمارگیری و قەومایەتی و حزبی و مەزهەبی.

– بەشداری پێکردنی هەڵسەنگێنەری دەرەکی لە هەڵسەنگاندنی کار و خزمەتگوزارییەکانی دامەزراوەکە هەموو ساڵێك.

– هەڵسەنگاندنی دەرئەنجامە بەدەستهاتووەکان لە کۆتایی هەموو: کۆرسێك / ساڵێك / قۆناغێك .

ئەمە پوختەی ئەو دۆسیانەن کە پشکنەر لە ئەنجومەنی دانپیانانی بەریتانی لە جانتاکەیدا لەگەڵ خۆیدا هەڵی دەگرێت لەکاتی سەردانییکردنی هەر دامەزراوەیەك، لەڕاستیدا ئەمانە دەرناچن لەو دە بنەمایانەی کە پێشنیارمان کردون بۆ هەر شارستانییەتێك کە ئەوانیش نوێژی جەماعەت دەیانچەسپێنێت و

بانگەوازیان بۆ دەکات، کە دەکرێت ئەو بزووتنەوەیەی کە لە نوێژی جەماعەتەوە سەرچاوە دەگرێ پیادەیان بکات بۆ گێڕانەوەی ئەو شتانەی کە لە هۆکاری بەدیهێنانی شارستانیەتدا کەمتەرخەمیمان تێدا کردووە.

جاری وا هەیە ئەم جوڵانەوەیە لە مزگەوتێك لێرە و لە مزگەوتێك لەوێ دەستپێدەکات و هەریەکەیان بە ڕەچاوکردنی مەرج و یاساکانی شارستانییەت کە ئاماژەمان پێدان و ڕەچاوکردنی ئەو بنەما و یاسایانەی کە پێویستە هەبن لە هەر دامەزراوەیەکدا دەکەونە کێبڕکێ بۆ ئەوەی دانیان پێدا بنرێ، زۆری پێناچێت کە لیژنە و ئەنجومەنی مزگەوتەکەمان کۆدەبنەوە و کاردەکەن بۆ تاوتوێکردنی هەندێ یاسا و مەرجی هاوبەشی دامەزراندنی یەك ئەنجومەنی یەکگرتوو، پاشان ئەم یاسا و بنەمایانە گەشە دەکەن و فراوان دەبن بۆ ئەوەی ببنە یاسای بنەڕەتی بۆ (ئەنجومەنی نیشتیمانی دانپیانانی دامەزراوەکان) لەسەر ئاستی دەوڵەت.

لە وڵاتی میصرەوە یان هەر وڵاتێکی ئیسلامی ترەوە ئەم پڕۆژەیە ئەم بزووتنەوەیە دەستپێبکات، پاشان مەشروعەکە بگوازێتەوە بۆ تەواوی جیهانی ئیسلامی، ئەگەر ئەم ئەنجومەنە بە شێوەیەکی دروست و چاك پلانی بۆ دابڕێژرێ ڕەنگە جیهانی ئیسلامی بەچەند دەیە ساڵێك بگێڕێتەوە بۆ جێ شارستانییەکەی خۆی و ڕۆحی بیرکردنەوەی ئایینی شارستانی دروست و زیندوو بکاتەوە لە جیهانی ئیسلامی و غەربیدا، ئەویش لە ڕێگەی زیندووکردنەوەی لایەنی کردارییی لە ئایینی ئیسلامدا و پەیوەستکردنی پەرستشەکان –سەرەتا لە نوێژەوە– بە ژیانی گشتی و گێڕانەوەی ڕووی گەشی شارستانی ڕاست و دروستی ئیسلام لەلای جیهان، بەڕاستی ئەمە کارێکی گەورەیە، بەڵام هەموو ڕێگەیەکی دوور لە هەنگاوێکەوە دەستپێدەکات، ئەگەر ئەم بابەتە بەجیددی پێویست وەربگرین دەتوانین بە دامەزراندنی ئەم ئەنجومەنە شتێك بێنینە ئارا کە هەر ئێستا چەندین نەوە لە حکومەت و بیرمەندان نەیانتوانیوە بیهێننە دی.

# پێنج هێڵەکان بۆ نوێژ

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾ {النساء:٤٣} . واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە نزیکی نوێژ مەکەون لە کاتێکدا ئێوە سەرخۆشن هەتا ئاسەواری سەرخۆشی نامێنێت و دەزانن چی دەڵێن).

چەند جار رووکەشیی ئەم ئایەتەمان خوێندۆتەوە، بەڵام وانەکانی پشت ئایەتەکەمان نەخوێندۆتەوە.

ئەگەر لە ڕێگادا چاومان بە مرۆڤێك بکەوێت قسە بکات و دەستەکانی بجوڵێنێت و سەری بابدا بەملاولادا، بەڵام بەتەنها بێت و کەسی لە دەورە نەبێت، یەکەم شت کە گومانمان بۆی بچێت ئەوەیە کە دەڵێین رەنگە سەماعەیەکی پەیوەندیکردنی تەلەفونی دەستی لە سەری قایم کردبێت و لەگەڵ یەکێکدا قسە بکات بە تەلەفون، ئەگەر جوانتر ورد بوینەوە لێی و هیچ تەلەفونێکی دەستیمان بەدەمیەوە نەبینی و هیچ سەماعەیەکی لە گوێدا نەبوو، هیچ تەلەفونێکمان بەدەستییەوە یان لە گیرفانیدا بەدی نەکرد، ئەوە چارەمان نامێنێت تەنها ئەوە نەبێت کە بڵێین ئەم پیاوە تێکچووە و ئاگای لە خۆی نەماوە، یان سەرخۆشە و لەخۆیەوە قسە دەکات، ئایا من زیادەڕەوی ناکەم کە ئەم قسەیە دەکەم؟

ئەمە نموونەی زۆرێك لە نوێژخوێنانە لە نوێژەکانیاندا لەگەڵ بوونی جیاوازییەکی گرنگ لەنێوان ئەم دوو حاڵەتەدا، کە سەیریان دەکەیت لە نوێژدا کەس نابینی لە تەنیشتییان قسەی لەگەڵ بکەن، وەکەسیان تەلەفونیان بە دەستەوە نییە، لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە بەشێوەیەك قسە دەکەن کە هەست ناکەی قسە لەگەڵ کەس بکەن، یان بە گوزارشتێکی تر بڵێین: خۆشیان نازانن چی دەڵێن.

زۆر جیاوازە ئەگەر قسە بکەیت و لە ئاکار و دەموچاوتدا دەربکەوێت کە لە قسەکانتدا مەبەستت شتێکی دیاریکراوە و کەسێك هەیە کە لەگەڵی دەئاخفیت، لەگەڵ ئەوەی کە تەنها دەم و زمانت بجوڵێنیت و پێتەوە دیار نەبێت کە لەگەڵ

کەسێك قسە دەکەیت، یان شتێکی دیاریکراوت مەبەستە، ئەمەی دووەمیان جۆرە نەخۆشیەکی سەیرە و زۆر ترسناکە.

قسەکردنی ئەو جۆرە کەسانە وتنی یەکلەدوای یەکی چەند وشەیەکی مانادارە لە بنەڕەتدا، بەڵام وا نەماوە و وادەرناکەوێت، لە سەیرکردنی ئاکار و شێوەی دەم و چاویان و لەدەرچوونی وشەکان لە لێوەکانیان و کاردانەوەیان لەسەر دەموچاویان هەست بەهیچ ئامانج و مەبەستێك ناکرێت، بەشێوەیەك بەرز و نزمی دەنگ و نەغمە و مۆسیقای وشەکان و پەیوەستی و یەکلەدوای یەکی ماناکانیان واناگەیەنێت کە بەئامانج و لەبەرامبەر یەکێکدا بە تەلەفون، یان رووبەڕوو قسە بکەن.

ئێستا تاقی بکەرەوە، دەست بدەرە تەلەفونەکەت و پەیوەندی ببەستە لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانت و بە خێزانەکەت، یان یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەت بڵێ با ژمارەی گۆڕانکاری لە شێوەی دەموچاو و نەبرەی دەنگ و شێوازی قسەکردنت تۆمار بکات هەتا لە تەلەفونەکەت دەبیتەوە بزانە چەند جار ئەم حاڵەتانە دوبارە دەبنەوە؟ لە راستیدا ئاکاری دەموچاو و نەبرەی دەنگ و دەستجوڵانەوە و حاڵەتی جەستەییمان دەیان جار دەگۆڕێت و رەنگاورەنگ دەبێت لەکاتی پەیوەندی تەلەفونی ئاساییدا بەهۆی رووداوەکانی ناو ئەو قسانەی دەیکەین لە: هێنان و بردنی یەکتر و داواکاری و جەختکردنەوە لەسەر داواکارییەك و بەڵگە و بەهانە هێنانەوە بۆی و بێهیوایی و سەرسوڕمان و قەبوڵکردن و رەتکردنەوە و لۆمەکردن و خۆپاراستن و رەچاوکردنی شتێك و سوپاس و پێزانین و پرسیار و وەڵام و ترس و تەماع و ناچارکردن و نەفیکردن و جیاکردنەوە و دەرهێنانی هەندێك شت لە هەندێکی تر و هەڵوێستەکردن لەسەر شتێك و بەدواداچوون و گەڕانەوە بۆ سەر شتێك و دوودڵیمان تیایدا و تووڕەبوون و پێکەنین و...هتد، ئەگەر ئەم حاڵەتانە روونەدەن ئەوە ئێمە تەنها وەك مرۆڤێکی ئالی و رۆبۆت واین.

هەوڵتان داوە لەکاتی نوێژدا دڵنیابن لەوەی کە ڕۆبۆت نین، یان سەرخۆش، یان شێت نین؟ هەوڵتانداوە وا هەست بکەن کە لە نوێژدا ئێوە لە پەیوەندیدان لەگەڵ یەکێکی تر وەك "هەریەکەمان" پەیوەندی لەگەڵ یەکێکی تردا دەبەستێت بە تەلەفون لەگەڵ هاوڕێکەی، یان مامۆستاکەی، یان بەرپرس و سەرۆکەکەی؟ هەوڵتانداوە لە نوێژدا وا هەست بکەن کە بەرامبەرێکی زیندوو هەیە پەیوەندی لەگەڵ دەبەستن و بۆخۆتان تەنها قسە لەگەڵ خۆتان ناکەن؟ یان وا قسەناکەن کە بۆخۆشتان نەزانن چی دەڵێن و کەس لەبەرامبەرتان نییە؟ بەشێوەیەك نین کە خەڵك تۆمەتبارتان بکات بە ڕۆبۆت و شێت و خەڵەفاو؟

ئەگەر بەڕاستی دڵنیان و باوەڕتان وایە لە هێڵەکەی تر خوداتان لەگەڵە بەشێوەیەك گفتوگۆی لەگەڵ دەکەن و گوێتان لێدەگرێت و ناوی دەهێنن و داواکاری لێدەکەن و وەڵامتان دەداتەوە، ئەمە بە چ شتێك دەسەلمێنن بۆ ئەو کەسانەی سەیرتان دەکەن و گوێیان لێتانە؟ یاخود چۆن ئەمە بۆ خودی خودای گەورە دەسەلمێنن لەکاتێکدا کە ئەو گوێی لە نەبەرەکانی دەنگتانە و شارەزاو بەئاگای لێدانی دڵەکانتانە زانایە بەوەی کە لەناو سینگتاندایە و دەزانێ کە ئێوە قسە لەگەڵ ئەودا دەکەن نەك بە شێوەیەك قسە دەکەن کە لە بەرامبەرتاندا کەس نییە؟

- ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾ {المؤمنون: ١ـ ٢}. واتە: (بەڕاستی بڕواداران سەرکەوتوو و سەرفراز بوون، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراون و دڵیان لەلای خودایە).

- ﴿ فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ، الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴾ {الماعون: ٤ـ ٥}. واتە: (جا هاوار و واوەیلا بۆ نوێژکەرانێك، ئەوانەی گوێنادەن بە نوێژەکانیان و کاریگەری نییە لەسەریان و دڵی نادەنێ و لێی غافڵن).

بەڕاستی هەر چرکەساتێکی پەیوەندی کردن بە خوداوە ئەگەر بێ هیچ وشە و

ئاخاوتنێکیش بێت زۆر باشترە لە خوێندنەوەی چەند لاپەڕەیەك کە بیخوێنینەوە بەشێوەیەك هیچ پەیوەندیکردنێك نەهێنێتە دی، خودای گەورە سەیری دڵەکانمان دەکات نەك زمانمان، ئەگەر چرکەیەك بە دڵ قسە لەگەڵ خودا بکەیت چاکتر و گەورەترە لە سەد ساڵ قسەکردن بەبێ ئاگایی دڵ، ئەمە ئەگەر بەڕاستی بمانەوێت بگەین بە خودا، جارێکی تر پەیوەندی ببەستینەوە بە خوداوە و دڵ و دەروونمان لەسەر ئەو پەیوەندییە رابهێنین، ئەگەر بمانەوێت بەهۆی نوور و چاکەی ئەوەوە رێگای سەرفرازیمان رووناك بکەینەوە، بەهۆی چاکەی نوێژەکانمان خراپەی دڵ و دەروون و هەڵەی رۆح و ناخمان بسڕینەوە.

ـ ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ {هود: ١١٤}. واتە: (نوێژ بەچاکیی ئەنجامبدە لە هەردوو سەری رۆژەوە – مەبەست نیوەڕۆ و عەسرە – و لە سێ کاتەکەی شەویشدا – مەبەست مەغریب و عیشا و بەیانییە–، بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردارە خراپەکان لا دەبات و گوناهەکان دەشۆنەوە).

نوێژ راهێنانێکی وەرزشی جەستەیی نییە ئەگەرچی ئەو سوودەش دەگەیەنێت، تەنها کاتێکی ئاسایی نییە تایبەتی بکەین بۆ بەڕێکردنی و کە تەواو بوو بچین بۆ جێبەجێکردنی کارێکی تر، وتنی چەند وشە و رستەیەك نییە دەم و لێو و زمانمان بجولێنین پێی، ئەگەرچی بەشێکی نوێژەکانمان بەوانە ئەنجام دەدرێن، بەڵکو ئەو نوێژەی بەندەکان ئەنجامی دەدەن دابەش دەبێت بەسەر پێنج هێڵی هاوتەریب و پەیوەست و تەواوکار، کە بەبێ یەکتر نابن و لە یەکتر جیا نابنەوە ئەگەر بمانەوێت پەیوەندییەکەمان لەگەڵ خودا پەیوەندییەکی راستەقینە بێت، ئەم هێڵانە لەناو روکنی نوێژەکاندا نابینرێن کە باس کراین، بەڵام لە راستیدا پایەی ئەو روکنانەن و نوێژ بەبێ ئەم پێنج هێڵە بە نوێژ ئەژمار ناکرێت، ئەوانیش:

**١ـ هێڵی کات:** هەوڵ مەدە قەناعەتم پێبکەی یان قەناعەت بە خۆت بکەیت کە

نوێژی نیوەڕۆ، یان عەسر، یان ئەوانی تر بە پێنج خولەك تـەواو دەكـەیت، چـونكە ئەمە كارێكی ناتەواوە، لەڕاستیدا ئەو كاتەی تەرخانی دەكەیت بـۆ نوێـژ بابـەتێكی سەرەكییە لەوەی كە تۆ بیسەلمێنی، یان نەیسەلمێنی كە نوێژت كـردووە، یـان لـە نوێژەكەتدا پەیوەندییەكی دروستت بەستووە لەگەڵ خودا. رەنگـە گـرنگترین كـات لەم هێڵەدا ئەوكاتە بێت كە لە نێوان دوو ئایەتدا چـەند چركەیەك بێـدەنگ دەبیـت یان لە نێوان دوو وشەدا هەڵوێسـتە دەكـەیت، بـا وشـەكان لەسـەر زمانـت پاڵپـاڵێن نەكەن هەریەكەیان بیەوێت پێش ئەوی تر بێتە دەرەوە چێژ لە وشەكان وەربگرە و ئەمدیواودیویان بكە وەك چۆن هەریەكەمان هـەنگوین لـە نـاو دەمیـدا ئەمـدیواودیو دەكـات بەچـێژەوە تاقیدەكاتـەوە بزانێـت هـەنگوینی دروسـت و بـێ فێڵـە، یـان بەپێچەوانەوە، بۆیە ماف هەر رسـتەیەك یـان دەربڕینێـك بـەڵكو هـەر وشـەیەك بـدە بەوەی كەمێك لە نێوانیاندا بێدەنگ ببە، بەشـێوەیەك دیواودیـوی بكـە لـە عەقڵتـدا ماناكەی بەرجەستە بكە و چێژ وەربگرە بە تامكردنیان، دڵنیابـە لـەوەی كـە لێیـان دانەبڕاویت و ماناكانیان حاڵی بوویت و گرنگیت بە ناوەڕۆكەكـەی داوە، وا بكـە كـە نیوەی نوێژەكەت بێدەنگی بێت نیوەكەی تری موناجاتێكی لەسەرخۆ و راستگۆیانە بێت و لە یەك سەرچاوەوە وشەكانی دەربچن ئەویش دڵ و دەروونتە، بۆ یەك روگـە بێت، ئەویش بۆ لای خودای بەرز و بڵند.

**٢ـ هێڵی زمان:** بەهۆیەوە چەند بتوانین ئەو شتانە بخوێنینەوە كـە پێغەمبـەری خودا بۆی دیاری كردوین و ماف هەر وشەیەك بدەین لەدەربڕیندا، لە بەرزی و نزمـی و نـەبرە و ئـاوازدا بەشـێوەیەك كـە لـە نێـوان وتـن و جموجوڵـەكانی نـاو نوێـژدا هاوسەنگی دروست بكەین، هاوسەنگییەك كـە خشـوع و ملكەچـی بـەبێ ئـەو تـەواو نابێت، ئاگابوونی ناو نوێژ بـەبێ ئـەو نایەتـە دی، بەهۆیـەوە لـەنێوان ئەندامـەكانی لەش گونجان و رێكوپێكی جوڵانیان بەتەواوی دروست دەبێت.

**٣ـ هێڵـی جەسـتە:** پێویسـتە جەسـتەمان بەشـێوەیەك بێـت كـە شـێواز وێنـا و

ئاماژەکانی دەموچاومان تەعبیر و وەرگێڕاوی ڕاستگۆیانەی ئەو مانایانە بێت کە بەزمانماندا دێت بەشێوەیەك لاشە و دەموچاوەکانمان تەعبیر بدەن لەو مانایانەی کە لەسەر زمانمانە تەنانەت ئەگەر ئەو زمانەش نەجوڵێت وشەکانی دەرنەبڕێت، نابینیت ئەو کەسانەی کە لاڵن و توانای قسەکردنیان لەدەستداوە هەموو توانای دەربڕینیان دەخەنە دەموچاو و لاشەیانەوە بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی زمانیان، هەر لە لاڵەکانەوە نوێژەکەت فێر ببە، با لە سەرەتاوە نوێژەکەت نوێژی ئەو کەسانە بێت کە کە ناتوانن قسە بکەن، پاشان یارمەتی بدە بەوەی کە خودای گەورە پێی بەخشیوی لە توانای قسەکردن و دەربڕین.

٤- **هێڵی دڵ:** دڵەکانمان لێدەدات بەو شتانەی کە زمانمان قسەی پێدەکات بەشێوەیەك یەکتر پشتڕاست دەکەنەوە، بۆیە نابێت دەروون و ئەو شتانەی بە دڵماندا دێن لە شیوێك بن و زمانیشمان لە شیوێکی تر، چەند خۆشە ئەم دوو هێڵە — زمان و دڵ— یەکبگرن و کارێك بکەن ببنە هۆی موو گرژ بوون و موچرکە هاتن بە لەشدا و گۆڕانی ڕەنگی دەموچاو و دەنگ پچڕ پچڕە پێکردن و کۆبوونەوەی فرمێسك لە قونچکە چاوەکاندا.

٥- **هێڵی کردار:** پاشان نیەت و عەزیمەت یەکدەگرن لامان لەکاتێکدا کە نوێژ دەکەین، لەسەر ئەوەی ژیانی ڕۆژانەمان ببێتە پراکتیزەکردنێکی کرداری بۆ هەردوو هێڵەکانی دڵ و زمان —کە باسمانکردن— لە نوێژدا، بەشێوەیەك کردارەکانمان قسەکانمان پشتڕاست بکەنەوە، ژیانی ڕۆژانەمان وێنەی ڕوونکەرەوە (الرسم البیانی) بێت بۆ ئەو کردار و گوفتارانەی کە لە نوێژەکانماندا ئەنجاممان داون و وتوومانننەوە، نابێت نوێژەکانمان تەنها چەند کردار و ڕێسایەکی پەرستشی رووکەش بێت و پەیوەست نەبێت بە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەمانەوە، بەڵکو دەبێت جیا نەبێت لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەمان و پەیوەندییەکانمان لەگەڵ خەڵکدا و لەگەڵ زاتی پەروەردگاردا، چۆن دەستنوێژمان کرد بە دوو جۆرەوە با نوێژەکانیشمان بکەین بە

دوو جۆرەوە: نوێژی دەرەکی و نوێژی ناوەکی، دەبێت لە یادمان نەچێت کە نوێژ لە قورئان و فەرموودەکاندا هەمیشە پەیوەستە بە لایەنی کرداریی و جێبەجێکردن و فەرمان بە چاکە و بەرگریکردن لە خراپە:

- ﴿يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ {لقمان: ١٧}. واتە: (ئەی کوڕەکەم نوێژەکانت بەچاکی ئەنجام بدە و فەرمان بکە بە چاکە و قەدەغە بکە لە خراپە و گوناه بەئارامبە لە بەرامبەر ئەو ناخۆشیانەی تووشت دەبن، بەراستی ئەوانەی کە باسکران لەو شتانەن کە دەبێت بکرێن و لەکارە گرنگەکانن).

- ﴿فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾ {مريم: ٥٩}. واتە: (لەدوای ئەوان کەسانێك لە نەوەکانیان بوونە جێنشین کە نوێژەکانیان بەزایە دا و شوێنی ئارەزووەکانی نەفسیان کەوتن، ئەوانە توشی گومڕایی و سەرگەردانی و سزا دەبن).

- ((مَنْ لمْ تَنههُ صلاتُهُ عَن الفَحشاءِ والمُنكَر لَم يَزددْ بِها مِنَ اللهِ إلا بُعدًا)) *{رواه السفاريني الحنبلي في شرح كتاب الشهاب، عن عبد الله بن عباس}*.

واتە: (ئەگەر کەسێك نوێژەکەی نەیگێڕێتەوە لە گوفتار و کرداری ناشرین و ئەو شتانەی کە شەریعەت بە خراپی داناون ئەوە ئەو نوێژەی تەنها دەبێتە زیادبوونی دوورکەوتنەوەی لە خودای گەورە).

هەر بۆیە:

- نوێژ بکە بەلاشەت وەك ئەوەی دەموچاوت پێوە نەبێت.
- نوێژ بکە بە ئاکارەکانی دەموچاوت وەك ئەوەی زمانت نەبێت.
- نوێژ بکە بە نەبرەی زمان و گوفتارت وەك ئەوەی لاشەت نەبێت.
- نوێژ بکە بە ترپەی دڵت وەك ئەوەی لە کۆتایی دڵ لێدانتدا بێت.
- نوێژەکەت درێژ بکەرەوە وەك ئەوەی ئەمە کۆتا نوێژت بێت.

هیچتان بیستووە سەبارەت بە مرۆڤێك کە بانگهێشتنامەیەکی پێگەیشتووە سەبارەت بە ئامادەبوونی بۆ ئاهەنگێکی گەورە لە وڵاتێکی دوور، ئەویش جوانترین جلی لەبەر بکات و ئەرك و ماندووبونی ئەو سەفەرە دوورە هەڵبگرێت و پارە و کاتی خۆی سەرف بکات بۆ ڕۆیشتن بۆ شوێنی دیاریکراو، چەندین فرسەت و کاری تر لە قیس خۆی بدات، کاتێك کە دەگاتە ئاهەنگەکە بانگهێشتنامەکە نیشان دەدات و دەیکەنە ژوورەوە و لە جێگایەکی دەستنیشانکراودا دایدەنیشێنن و لە ئاپۆڕای ئامادەبواندا چاوەڕێی دەستپێکردنی ئاهەنگەکە دەکات.

بەڵام پاش چەند خولەکێك بێئاگا بوون چاو هەڵدێنێت سەیر دەکات پەردەکان جاریَ لانەدراون.. کاتەکەش لایداوە.. لەپڕ خەبەری دەبێتەوە لە دەنگی پاککەرەوەی هۆڵەکە بەوەی داوای لێدەکەن ئەم شوێنە بەجێبهێڵێت بۆ ئەوەی بتوانن پاکی بکەنەوە، بە مەزندە ئاهەنگەکە دەستی پێکردووە و تەواویش بووە خەڵکیش چوونەتەوەماڵەوە و کەس لە هۆڵەکەدا نەماوە تەنها ئەم هاوڕێیە خەوتووەمان نەبێت؟!

ئەمە حاڵی ئەو کەسەیە کە پلان بۆ نوێژەکەی دادەنێت بە بانگهێشتنامەی خودایی، کاتێك کە دەستنوێژی بۆ دەگرێت و دەچێت بۆ مزگەوت و کاتی بۆ سەرف دەکات، ڕەنگە پارەشی بۆ سەرف بکات بۆ گەیشتنی بە شوێنی ئەنجامدانی نوێژەکەی، ماوەیەك لە مزگەوتدا دەمێنێتەوە، ماوەیەکی کورت یان درێژ، کەچی لە نوێژ تەواو دەبێت بەبێ ئەوەی هیچ تام و چێژێکی لە دیمەنە ڕوحییەکانی وەرگرتبێت یان کاریگەر بووبێت بە هەڵوێست و مانا بەرزەکانی، یان وا هەست بکات کە پەیوەندی بەستووە لەگەڵ خولقێنەرەکەی، یان توانیویەتی ئەو پاداشتە چاوەڕوانکراوە بەدەستبهێنێت کە چاوەڕوان دەکرێت دەستی بکەوێت!!

کاتێك کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) برایەتی خستە نێوان موسوڵمانانەوە، یەکێك لەو دوو هاوەڵانەی برایەتیان هەبوو لەگەڵ یەکتردا، لە

شەڕێکدا شەهید بوو، پاش هەفتەیەك ئەویتریشیان شەهید بوو، موسوڵمانان بۆ دووەمیان وتیان خودایە لێی خۆش ببە و بیگەیەنە بە براکەی، پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) فەرمووی: ((فَأَينَ صلاتُهُ بعْدَ صلاتِهِ.. وعَمَلُهُ بعْدَ عمَلِهِ إنَّ بَينَهُما كما بَينَ السَّماءِ والأرْض)) *{رواه أبو داود وصححه الألباني عن عبيد بن خالد السلمي}* .

واتە: (نوێژەکانی ئەم کە لەدوای مردنی ئەودا لەکوێیە.. کردەوەکانی ئەم لە دوای کردەوەکانی ئەو لەکوێیە) واتە: جیاوازییان زۆرە، ئەم نوێژ و کردەوەی چاکی زیاتری کردووە و پلەی بەرزترە.

الله.. ئەگەر نوێژی یەك هەفتە پلەی نوێژخوێنی بەکردەوە بەقەدەر نێوان ئەرز و ئاسمان پلەکانمان بەرز بکاتەوە، باشە بەشی نوێژێك لەو ڕێژەیە دەبێ چەند بێت؟! جارێکی تر لە فەرموودەکە وردبەرەوە ((فأين صلاته بعد صلاته؟)) سەیرکە ڕاستەوخۆ پرسیارێکی تری فەرموو کە پەیوەستی یەکترن و نابێ لە یەکتر جیا ببنەوە ((وعمله بعد عمله؟))، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە بیرمان بخاتەوە کە لەنێوان نوێژ و کردەوەدا وابەستەبوونێکی یەك جەستەیی هەیە ناکرێ لە یەکتر جیا بکرێنەوە.

لەدوای هەر نوێژێك پرسیار لە خۆت بکە: هەتا چەند نوێژەکەم بەرزی کردوومەتەوە؟ تا سەروو ئاسمانەکان؟ سەر مانگ؟ سەروو هەورەکان؟ سەروو بنمیچی خانووەکەم؟ بستێك سەروو خۆمەوە؟ پەنجەیەك؟ هیچ؟ مەڕۆ دەرەوە لە مزگەوت هەتا دڵنیا نەبیت کە ئێستا ئەو کەسە نەماویت کە پێش چەند خولەکێك هاتیتە ناوی.

## کـلیـلی ســووری ژمـــاره (١): الله أکـــبر

جگە لەوەی کە لە دەربڕینی (الله أکبر)دا بناغەیەك لە تایبەتمەندیی ناوازەیی و هێزێکی سەرسوڕهێنەری ڕەها هەیە کە دەمانبات بۆ شوێنێکی دوورتر لە زەوی — وەك دەیبینین لەمەودوا — جگە لەوە ئەم خودا بەگەورەگرتنەی سەرەتای نوێژ تایبەتمەندییەکی تری هەیە لەسەرووی ئەو تایبەتمەندیەوەیە، ئەویش (الله أکبر)ە بۆ چوونە ناو حەرەمی نوێژەوە (احرام)، ئەمە مانای ئەوەیە دەچینە شوێنێکی زەمەنی حەرام کراوەوە، ڕێك وەك چوونە ئیحرامی حاجییەکان لە سەرەتای حەجدا.

ئەگەر یەکێك پێت بڵێت: (دوژمن لاوازترە) پاشان بێدەنگ بێت ئەو کات پێشبینیت چی دەبێت؟ لە دڵی خۆتدا دەڵێیت: ئێ دوای ئەوە چی؟! بۆچی ڕستەکەی تەواو نەکرد؟! یان لە دڵی خۆتدا دەڵێی ڕەنگە بێدەنگبوونەکەی لەبەر ئەوە بووبێت، چونکە شتێکی بیر کەوتۆتەوە، یان دەڵێی ڕەنگە ئەمەی بۆیە وتبێ لەبەر هۆکارێك ویستبێتی ڕستەکە بگۆڕێ، یان ڕەنگە شتێکی بەسەرهاتبێ لە ڕووی تەندروستییەوە نەیتوانیبێت ڕستەکە بەتەواوی و بێ کەم و کوڕی تەواو بکا... ئەم ڕاڤەکردنانە دێن بە دڵتدا، چونکە تۆ وا چاوەڕوانبویت کە رستە و گوفتارەکەی وەك هەموو ڕستە و گوفتارێکی تر بەشێوەیەکی تەواو و داخراو و پڕ مانا دەربڕیبا کە لە یەکێك لەم دەستەواژانە چوبا: دوژمن زۆر لاوازترە لەوەی کە زاڵ بێت بەسەرماندا وەك ئەوەی پێشبینیمان دەکرد، دوژمن لاوازترە لەوەی کە گومانمان دەبرد، یاخود: ئەم دوژمنە لاوازترین دوژمنە کە ڕووبەڕوومان بۆتەوە...

ئەم دەستەواژانە (العدو أضعف من أن یواجهنا)، یان (العدو أضعف من..) هاوشێوەکانی لە زمانی عەرەبیدا، وشەی (أضعف) یەکێکە لە پلەی بەراورد، پێویستە (مِن) لە دوایەوە هەبێت، یان بدرێتە پاڵ وشەیەکی تر، بەڵام دەربڕینە

سەرسوڕهێنەرەکەی (الله أكبر) هیچ کام لە (من)، یان دانەپاڵێك (مضاف اليه)ی بەدوادا نەهاتووە، ئەمە جێگەی هەڵوێستەیە.

ئەم گوزارشتە (الله أكبر) خودای گەورە بەکراوەیی هێشتویەتیەوە ئەگەر ئەو (من) یان دانەپاڵی لەگەڵ بوایە، واتە درابایەتە پاڵ شتێك و وتبامان خودا گەورەترە لە... فڵانە شت، ئەوە ئەو کات لایەنە درێژپێدەرە خەیاڵییەکەی لەدەست دەدا، دەبوو بە دەربڕینێکی داخراو و شایستەی هیچ کۆششێکی وردبوونەوە نەدەبوو کە دەکرێ بە هەست و ناخماندا بێت: گەورەترە لە چی؟

بەڕاستی ئەم گوزارشتە خودای گەورە ئاوا بەکراوەیی بۆی بەجێهێشتوین کە چەندین مەزەندە لەخۆ دەگرێت لەدوای خۆی، هەموو ئەم مەزەندانەش فراوانن و ڕێگە دەخەنە سەرپشت بۆ ئەو کەسانەی کە گوزارشتی پێدەدەن لە زهنیاندا — نەك بە زمان — کە دەکرێ دەیان بەڵکو سەدان گریمانەمان مەبەست بێت، بۆ نموونە: خودا گەورەترە لە تۆ ئەی شەیتان، گەورەترە لە تۆ ئەی ستەمکار.. گەورەترە لە تۆ ئەی ماڵ و سامان.. گەورەترە لە تۆ ئەی خەم و پەژارە.. گەورەترە لە تۆ ئەی دڵخۆشی.. گەورەترە لە تۆ ئەی هەرشتێك کە ڕێگریم لێ دەکەیت کە لەگەڵ خوادا گفتوگۆ بکەم.

بەڕاستی ئەم گوزارشتە مانای (گەورە) نییە، بەڵکو ماناکەی (گەورەترە) بە پلەی بەراورد، کاتێك لە زمانی عەرەبییەوە وەردەگێڕدرێتە سەر ئینگلیزی، یان هەر زمانێکیتر، هەندێك لێیان تێکدەچێت وا مانای دەکەن کە مەبەست پێی (گەورە– great)یە، بەڕاستی وا وەرناگێڕدرێت و ڕاستەکەی ئەوەیە بڵێین (گەورەتر– the greatest) ئاوا بەم جۆرە وەرگێڕانە ئەم جۆرە گوزارشتانە بەشێك لە مانا و مەبەستە ئامانجدارەکەیان لەدەست دەدەن کە لێرە ئامانج لێی دەستپێکردنی نوێژە، بەهۆیەوە دەبنە گوزارشتێکی ئاسایی داخراو.

گویّ له زۆرێك له بانگبێژان بگره دەبینیت (الله أکبر)ەکانی بانگ تێکەڵ دەکەن و دەڵێن (الله أکبر ول الله أکبر) بەم کارەیان کەسایەتی گەورەی (الله اکبر)ی یەکەم بەفیڕۆ دەدەن و بەڕوونی دەرناکەوێت بۆ ئەوانەی گوێی لێدەگرن و وێنا ڕوونەکەی له دەست دەدەن، بۆیه ئەمه گوزارشتێکی کراوەیه له پشتییەوه بۆشایی خاڵ ئامێز هەیه دەبیّ پڕی بکەینەوه به هەست و ئەندێشەمان (الله اکبر...) ئاوا به سیّ خاڵ دوای خۆی.

ئەو (الله أکبر)ەی که نوێژەکەتت پیّ دەست پێکرد بریتیه له دوگمه سوورەکەی یەکەم لەنێوان چەندین دوگمەی سووری تر و ڕەنگی تر، ئەوانەی خەریکه هەڵیان بکەیت لەکاتێکدا که سواری کەشتییەکه دەبیت بۆ ئەوەی بەرزت بکاتەوه بەرەو ئاسمان.

## له نێوان خوێندنەوه و بەدوادا خوێندنەوەدا
## بين القراءة والتلاوة

یەکێك له برایان لێی پرسیم: بۆچی به بەرنامه قورئان ناخوێنین له نوێژەکاندا و پلان دانانێین بۆ هەڵبژاردنی ئایەتەکانی ناو نوێژ؟ دەبیّ چ هەست و خشوعێکمان پیّ ببەخشێت خوێندنەوەی هەندێك ئایەت که دەیخوێنینەوه له نوێژدا، بۆ نموونه ئایەتی: ﴿والمطلقات يتربصن بأنفسهن ثلاثة قروء﴾ {البقرة: ٢٢٨}. واته: (ژنانی تەڵاقدراو دەبێت تا سیّ سووڕی مانگانه چاوەڕیّ بکەن و (شوو نەکەنەوه)). ئەم ئایەته و هاوشێوەکانی چۆن یارمەتیمان دەدات بۆ پەیوەستبوونمان به خواوه و ملکەچبوون له خزمەتیدا؟ چونکه بەڕاستی کاتێك دەست دەکەیت به خوێندنەوەی قورئان دەبێت لەبەرچاوت بێت که تۆ قسه و گوفتاری مرۆڤێکی ئاسایی ناخوێنیتەوه بەڵکو تۆ دەقی خودایی، تۆ قورئان ناخوێنیتەوه، بەڵکو تۆ (التلاوة) بۆ قورئان دەکەیت، که ئەم دوو دەستەواژەیه

جیاوازییان هەیە وەك باسی دەكەین. لە پێش هاتنی قورئان عەرەب وشەی (تلا)ی تەنها بۆ (بەدوایداهات ـ تبع) بەكاردەهێنا، بۆ نموونە: لە ڕستەدا دەیانوت (دخل علینا رجل وتلاه آخر – پیاوێك هاتە ژوورەوە بۆ لامان بە دوایدا پیاوێكیتر)، بەڵام قورئانی پیرۆز ئەم مانا كۆنەی هێنا بەكاریهێنا بۆ بەدوایەكدا هاتن لە خوێندنەوەدا. بەو پێیەی كە وشەكانی قورئان لەسەرەتادا لەلایەن خودای گەورەوە دەرچوون پاشان بەدوایدا جبرائیل گوتویەتیەوە و دووبارەی كردۆتەوە، پاشان پێغەمبەری خودا بەدوایدا وتیەوە و شوێن خوێندنەوەكەی ئەو كەوت، بۆیە كاتێك ئەمڕۆ ئێمە هەریەكەمان ئایەتەكانی خودا دەخوێنینەوە، ئەوە ئێمەش شوێن پێغەمبەری خودا دەكەوین لە خوێندنەوەیدا وەك ئەوەی بەدوای ئەودا بیڵێینەوە، بەشێوەی ئەو وتنەوەیەی كە پێغەمبەری خودا بەدوای جبرائیلدا وتیەوە و ئەویش بەدوای خودای گەورەدا وتیەوە.

كەواتە ئێمە قورئان دەڵێینەوە بەو زنجیرەیەی كە باسمانكرد. دەزانی گرنگی ئەم خاڵە لە چیدایە؟ ئەمە كردەوەیەكی وتنەوەی زنجیرەیی بەردەوامە لەنێوان ئێمە و لەنێوان خودای گەورە وامان لێدەكات لەكاتی خوێندنەوەی قورئاندا كە هەست بكەین بە پەیوەستبوونی ڕاستەوخۆ و گەرموگوڕ و نەرم لەنێوان ئێمە و خودای گەورەدا، لەڕێی ئەم زنجیرە ئەڵقە پیرۆزە بەیەكتر گرێدراوانەوە كە خوێنەریش دەبێتە یەكێك لە ئەڵقەكانی، بیهێنە پێش چاوت كە قورئان دەخوێنێتەوە خۆت لە چ ئاستێكدا دادەنێیت لەم زنجیرە پیرۆزەدا؟

ڕەچاوكردنی یاساكانی تەجویدیش ڕۆڵێكی گەورە دەگێڕێت لە پارێزگاریكردن لە گواستنەوەی ئەو ڕاسپاردە نەقڵییە و ئەوپەڕی وردەكاری تیایدا، بە ڕەچاوكردنی یاساكانی ئیدغام و (مدّ – درێژكردنەوە، فصل – جیاكردنەوە، وصل – لكاندن، وقف – وەستان..) جۆرێك لە ڕاهێنانمان فێر دەكات لەسەر پاراستنی ئەمانەتی ڕەها لە وتنەوەی قورئان بەشێوەیەك كە ڕاماندەهێنێت كە خوێندنەوەكەمان

نوسخەیەکی ڕەسەن بێت بۆ ئەو خوێندنەوەیەی کە پێغەمبەری خودا گوێبیستی بووە لە جوبرائیل و ئەویش لە خودای گەورە.

تەنانەت یاساکانی تەجوید کاتێکی زیاترمان پێدەبەخشێت بۆ زیاتر ڕامان لە ماناکانی قورئان و وامان لێدەکات خێرا تێنەپەڕین بەسەر وشە و ماناکاندا بەبێ بەراوردکردن و تێپەڕاندن لەنێوان جووڵەی زمان و لێوەکان و جوڵەی ئەندێشە و خەیاڵ و بیرکردنەوەمان، تاقی بکەرەوە، جارێك سورەتی (الناس) بەبێ تەجوید بخوێنەوە، پاشان جارێکیتر بە تەجویدەوە دوبارەی بکەرەوە، بە تەجویدەوە تاموچێژی دوبارەکردنەوەکە دەبینی و بۆت دەردەکەوێت کە چۆن دوبارەکردنەوە کاتێکی زیاتر دەخایەنێت لە خوێندنەوە.

هەوڵبدە لە نوێژەکانتدا قورئان بەو شێوەیە بخوێنیتەوە کە باسمانکرد، چونکە بەم شێوەیە وات لێدەکات هەست بە بەرپرسیارێتی تاکەکەسی بکەیت بەرامبەری، بەرپرسیارێتیەك کە لە بەرامبەریدا بە خشوع و ترس و ڕێزی زیاتر تەعبیری لێبدەیتەوە، لەگەڵ زیاتر سووربوون لەسەر ئەمانەتی ڕەها لە کۆپیکردن و دوبارەکردنەوە و لەبەرکردنی ڕێکوپێکی وشەکانی خودای گەورە، وەك چۆن جوبرائیل– سەلامی خودای لەسەر بێت– گواستویەتەوە لە خودای گەورەوە.

## زمانە نوێیەکەی قورئان

ئەوەی کە هاوکارت دەبێت کە بەهۆیەوە پلەی خوێندنەوە بۆ قورئان خوێندن بەرز بکەیتەوە بۆ پلەی باڵای خوێندنەوە (التلاوة) ئەوەیە کە ڕاستییەکی گرنگ بەتەواوی تێبگەیت ئەویش ئەوەیە کە تۆ زمانێکی عەرەبی ئاسایی تەقلیدی ناخوێنیتەوە کە لە زمانی ئاسایی مرۆڤ بچێت، لە هەموو شتێك زیاتر کە موسوڵمانان و مرۆڤایەتی هەژاند یەکەمجار کە گوێبیستی قورئانی پیرۆز بوون جوانی زمانەکەی نەبوو، ڕەوانبێژییەکەی نەبوو، مانا وردەکارییەکەی و مۆسیقا و

ئیقاعەکەی نەبوو، بەڵکو لەگەڵ هەموو ئەمانەدا کە کۆبوونەتەوە تیایدا بەیەکەوە شتێکی سەرسوڕهێنەرتر، گەورەتر، بابەتێك کە لە زمانەکەیاندا نەیانبینیبوو لەگەڵ ئەو هەموو توانای باوەڕبەخۆبوون و لەخۆڕازیبوونەیان لە ئەدەب و شیعردا، ئەویش نوێــیی ئەم زمانە و تاقانەیی و جیاوازیی لە هەر عەرەبییەك کە پێی ئاشنا بوون، تەنانەت پێغەمبەری خواشی سەرسام کردبوو.

خۆیان پێشتر بە زمانی ئەم کەسە ئاشنا بوون کە لە دواییدا ئەم کتێبەی بۆ هێنابوون کەم تا زۆر زمانی ئەو جیاواز نەبوو لە زمانی خۆیان، بۆیە بابەتێکی چاوەڕواننەکراو و کتوپڕ و سەرسوڕهێنەر بوو لەڕووی زمانەوانییەوە کە بەیانییەك بەخەبەرهاتن بینییان ئەم پیاوە بە زمانێکی تەواو جیاواز لە زمانی جارانی خۆی و ئەوان قسە دەکات، ئەو زمانە لە هەموو ڕوویەکەوە جیاوازە، لە ڕووی وشە و گوزارشت و لکێنەر و پەیوەستبەندەکان و پەیوەندییە زمانەوانییەکەی و وێنا و تایبەتمەندیە ڕەوانبێژییەکەی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمە لایەنە ئیعجازییەکە و سەیر و سەرسوڕهێنەرەکەیەتی: پێکهاتووە لە زمانێکی عەرەبی پوخت و دامەزراو لەسەر یاساکانی زمانی عەرەبی، هەروەها پشت دەبەستێت بە بنەما سەرەکییە نەگۆڕەکانی، لەگەڵ هەموو ئەو سوود زیادکردن و دەوڵەمەندکردنەی کە خستویەتیە ناوی، لەگەڵ ئەو هەموو دەلاقە بێ سنوورەی کە کردویەتیەوە بەڕوویدا لە نوێگەریی و گەشەسەندن.

لەم کۆکراوە سەرسوڕهێنەرە لە یاسا سەرەکییەکانی زمان و پشتبەستن پێیان و پارێزگاریکردن لێیان بەسەلامەتی لەگەڵ گەشەسەندنیان لە ڕوویەکەوە، دەرچوون لە عورفە زمانەوانییە نەحویەکان لە ڕوویەکی ترەوە بەسە لە ئیعجاز کە بەهۆیەوە موچوڕکەمان پێدا بێت و ببزوێین و بلەرزین و ملکەچ بین لەکاتێکدا کە وتەکانی دوبارە دەکەینەوە لە نوێژدا، هەروەها ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی کە هەر بەشێك لە کتێبی خودا کە شایستە بێت بە وەرگرتنی ئەم ناوە تازە تایبەتە

وەربگرێت كە ئاماژەی ئەوەی تێدایە كە پارێزبەندكراوە و موستەحیلە سنوورەكەی بشكێنرێت بكرێت بەهۆی ئەوەی كە خودای گەورە پەرژینێكی وای بۆ كردووە تەقلید و ساختەكاری ناتوانن بیبەزێنن، وا هاتووە وەك قەلایەك وایە (سورة – پەرژین)، هەر بۆیەش هەموو دێڕێك یان پەرەگرافێكی قورئانی كە ئەم قەلایە دەیگرێتە خۆی شایستەیە كە ناوێكی نوێی بۆ دابنرێت كە عەرەب بەكاری نەهێناوە ئەویش وشەی (آیە)یە، بەڕاستی ئەم ناوە بۆی ناوێكی تایبەتی جیاوازە جەخت دەكاتەوە سەر لایەنی ئیعجازی قورئان و ڕێگری كردن لە تەقلید و هەڵخەڵەتاندن و سنووربەزاندن هەتا ڕۆژی دوایی.

*{بۆ درێژەی ئەم بابەتە بگەڕێوە سەر پێشەكی بەرگی یەكەم لە كتێبی ((المعجزة))، واشنطن، پەیمانگای جیهانی فیكری ئیسلامی، ٢٠١٢}.*

## زمانە كراوەكە و پانتاییە سەوزەكە

زۆرجار هەندێ وشە یان دەربڕینمان بەرگوێ دەكەوێت، یان دێتە ڕێمان لە ژیاندا، ڕاهاتووین لەسەر گوێبیستبوونیان و وتنەوەیان و تێپەڕبوونێكی ئاسایی بەسەریاندا، وەك هەر وشە و دەربڕینێكی ئاسایی، بەڵام لەڕاستیدا زۆرێك لەم وشە و دەربڕینانە هەروا سادەنین ئەگەر تۆزێك لێیان ورد ببینەوە و مێشكمان كەمێك دابماڵین لە ڕاهاتن و عادەتیبوون، با بەیەكەوە هەڵوێستەیەك بكەین لەسەر ئەم فەرموودە پیرۆزە:– پێغەمبەری خودا لە ڕكوع و سوژدەدا دەیفەرموو: ((سُبّوحٌ قُدّوس رَب المَلائِكَةِ والرُّوح)) *{رواه مسلم عن عائشة}*. وشەی (سبوح) وەك وشەی (سبحان) وایە ئەویش وشەیەكی ئیسلامی تازەیە كە عەرەب پێش ئیسلام گوێبیستی نەبوون، هەروەها هەردوكیان دوو وشەی كراوەن واتە دەتوانرێت ئەو وشە و مانایانەی بەدوادا بێن كە دەكرێ ناوی بنێین (ناوچەی سەوز – المسافة الخضراء) چونكە ئەم وشانە دەرگا بەڕووی بۆچوونماندا دەكاتەوە بۆئەوەی

بۆشایی دوای خۆی پڕبکەینەوە بە هەر یەك لەو مانا جوانانەی كە بێگەردیی خودای گەورە پیشان دەدات وەك وشەی (الله أكبر) كە باسمان كرد.

وشەی (سبحان) لە زمانی عەرەبیدا چاوگێكی نائاساییە كە لەسەر وەزنی (فُعلان)ە، هەروەك وشەی (سُـــبُّوح) وایە، واتە: بەرزڕاگرتنی ئەو كەسەی باسی دەكەین و بێگەرد ڕاگرتنی لە هەموو سیفەتێك، بۆیە كاتێك دەڵێین (سبحان ربي) واتە: خودای من بێگەردە، بەڵام بێگەردە لەهەر شتێك لەهەر سیفەتێك؟ ئەمە ئەگەر هیچ پاشگرێكی تری بۆ زیادنەكەین لە ڕكوع و سوژدەدا، بەكراوەیی بەجێی بهێڵین، ئەم دوو دەربڕینە لەڕاستیدا بەم شێوەیە تەواو نین لەپێشیانەوە بۆشاییەكی كراوە هەیە دەتوانین پڕی بكەینەوە بە زیاتر لە بژاردەیەك، وەك دەربڕینی (الله أكبر) كە باسمان كرد، ئەگەرنا ئەوە دەبوو پاشگرێكی لەگەڵدا بوایە، بۆ نموونە دەبوو وتبامان: سبحان ربی الاعلی/ العظیم ... عن النقص: لە نوقسانی، سبحان ربی الاعلی/ العظیم ... عن العیب: لە عەیب، عن التعب: لە ماندووبوون، عن الظلم: لە ستەم، لە هەڵە، لە لاوازی، لە خەوتن، لە نەخۆشی.

لە نوێژدا زۆر لەم دەربڕینە ڕەهاكراو و تەواونەكراوانە بەدیدەكرێن، واتا بەجێهێڵراو بۆ بۆشایی زمانەوانی سەوز و هەڵگری چەندین ئەگەری سەیرتر لەوە، هاتنی ئەم جۆرە دەربڕینانە لەگەڵ چەندین دەربڕینی تەواوكراو لەڕووی زمانەوە كە لە هەمانكاتدا هەڵگری چەندین مانا و دەربڕینی كراوەن لەگەڵ ئەواندا لەبەر چەندین هۆكاری زمانەوانی جیاجیا، ئەم جۆرە دەربڕینانەی دوایی لە وشە و دەربڕینەكانی سورەتی (الفاتحة) و زۆرێك لە سورەتەكانی تردا زۆرن، هەروەها لە تەحیات و صەلاواتی ئیبراهیمیدا هاتوون.

لەڕاستیدا ئێمە لە هەردوو ڕكاتێكدا كە دەیكەین بەشێوەیەكی جێگیر پتر لە (٣٣) دەربڕینی تەواونەكراو لەڕووی زمانەوانییەوە بەكاردێنین، ئەمەش واتا (٣٣) بۆشایی سەوز كە بۆمان دەستەبەر كراوە بۆ ئەوەی خەیاڵدانمان پڕی بكاتەوە بە

(ئەگەر–افتراضات)ەکانی، بۆ ئەوەی کاتی تەواومان پێ ببەخشێت بۆ تێگەشتنی ماناکانی و هێنانە یادیان و ئامادەکردنیان لە دەروونماندا لەکاتی نوێژدا. ئەم ژمارەیە سورەتی (الفاتحة) و تەحیات و صەڵاواتی ئیبراهیمی ناگرێتەوە، هەروەها ئەو ئایەت و دوعا و زیکرانەی تر ناگرێتەوە کە لە نوێژەکانماندا دەیخوێنین، ئەمەی خوارەوەش ئەو دەربڕینە جێگیرانەن لە دوو ڕکاتدا:

(١١) جار (الله أكبر – واتە خودا گەورەترە لە فلان شت دیاری نەکراوە) + (٢) جار (سمع الله لمن حمده – خودا گوێبیستی ئەو کەسانەیە سوپاسی دەکات (سوپاس لەسەر فلان شتە– دیاری نەکراوە) + (٢)جار (ربنا ولك الحمد – سوپاس لەسەر فلان شت– دیاری نەکراوە) + سبحان ربی العظیم – لە فلان شت و یان لە فلان شتە – دیاری نەکراوە + (١٢) سبحان ربی الاعلی (لە ٤ سوجدەدا) – (لە فلان شت و یان لە فلان شتە– دیاری نەکراوە).

ئەم چڕیی و زۆریی دەربڕینەکراوە و تەواونەکراوانە لەڕووی زمانەوە لە نوێژدا ئاماژەن بۆ گرنگیی لایەنی ئامادەگی یان خەیاڵی لە نوێژدا، بۆ دەوڵەمەندکردنی کرداری جۆراوجۆری و پاشان پارێزگاری لە زۆرترین ڕێژەی خشوع و ملکەچی و تێگەشتنی تەواو لەوەی کە دەیڵێین و هێنانەدی پەیوەندییەکانمان بە ئاسمانەوە.

## ڕۆڵی سورەتی (الفاتحه) و خوێندنەوەی قورئان

ئایا هیچ جار هەڵوێستەت کردووە لەسەر ئەو ڕاستیەی کە ئەم سورەتە تەنها دەستپێکی قورئان نیە بەڵکو دەستپێکی نوێژیشە؟ بەڵکو هەر بۆخۆی نوێژە وەك فەرمودە قودسییەکە ناوی براوە:

((قَسمْتُ الصَّلاةَ – أيِ الفاتِحَة، بَيْنِي وبَينَ عَبْدي نِصْفَين، فَنِصفُها لِي و نِصفُها لِعَبدِي، و لِعبدِي ما سَأَل. إذا قالَ العَبدُ (الحَمْدُ لِله رَبِّ العالَمِين) قالَ حَمَدَني رَبِّي وإذا قال (الرَّحمنِ الرَّحيم) قال أثنى عَليَّ عَبدِي، فإذا قال (مالكِ يَومِ الدِّين) قالَ مَجَدَني

عَبدِي، فإذا قال (إيّاكَ نَعبُدُ وإيّاكَ نَستَعِين) قالَ هذا بَينِي وبَينَ عَبدِي ولِعَبدِي ما سَأَل، فَإذا قالَ (اهدنا الصِّراطَ المُستَقيم، صِراطَ الّذينَ أنعَمتَ عَلَيهِم غَيرِ المَغضُوبِ عَليهِم ولا الضّالِّين) قالَ هذا لِعَبْدِي ولِعَبدِي ما سَأَل)) {رواه مسلم عن أبي هريرة}.

واته: (نوێژم له نێوان خۆم و بەندەکەمدا دابەشکردوه، نیوەی بۆ من و نیوەی بۆ بەندەکەم، بۆ بەندەکەشم فەراهەم دێنم هەرچی داوا بکات، هەرکات بەندەکەم وتی: (الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمِين) دەڵێ: بەندەکەم حەمد و سوپاسی کردم، ئەگەر وتی (الرَّحمنِ الرَّحيم) دەڵێم: بەندەکەم پێیدا هەڵدام، سوپاسگوزار بوو لەسەر نیعمەتەکان، ئەگەر وتی (مالِكِ يَومِ الدِّين) دەڵێ بەندەکەم بەبەرز و گەورەی دانام، ئەگەر وتی (إيّاكَ نَعبُدُ وإيّاكَ نَستَعِين) دەڵێ: ئەمە لە نێوان من و بەندەکەمدایە، بۆ بەندەکەشم فەراهەم دێت هەرچی داوا بکات، ئەگەر وتی (إهدنا الصِّراطَ المُستَقيم، صِراطَ الّذينَ أنعَمتَ عَلَيهِم غَيرِ المَغضُوبِ عَليهِم ولا الضّالِّين) ئەمە بۆ بەندەکەمە، بۆ بەندەکەشم فەراهەم دێت هەرچی داوا بکات).

ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: "نازناوی ئەم سورەتە بە (سبع المثاني) پشتڕاست بۆتەوە لە فەرموودە صحیحەکاندا و دەوترێ بۆیە (المثاني)یە چونکە دوبارە دەبێتەوە لە نوێژدا و لەهەموو کاتێکدا دەخوێنرێت".

ئایا هیچ جار بیرت لەوە کردۆتەوە کە ئەم سورەتە وەك گرێبەستێکی پیرۆز وایە لەنێوان دوو لایەندا پەرستەر و پەرستراو (العابد والمعبود) گوزارشت دەدات، کە لایەنی یەکەم (العابد) زامن بکات بۆ لایەنی دووەم (المعبود)، سوپاسگوزاری و شکورکردنی بەردەوام (الحمد لله) و دانانن بە گەورایەتی و بنیاتنەریتی خودا (ربوبية رب العالمين)، هەروەها بە ڕەحمەت و میهرەبانی بەردەوام (الرحمن الرحيم)، بە خاوەندارێتی و گەورایەتی ڕەهای ڕۆژی دوایی (مالك يوم الدين)، بە بەندایەتی و تەسلیمبوون و یەکتاپەرستی (إياك نعبد). لایەنی دووەم (المعبود) لە بەرامبەردا زامن بکات بۆ لایەنی یەکەم (العابد) کە: یارمەتی بدات لە هەموو

کارەکانیدا (إیاك نستعین)، هەروەها ڕێنمایی بکات لە دنیادا بۆ (صراط المستقیم) کە ئەو کەسانە ڕێنمایی دەکات بۆ ئەو ڕێگەیە لە خۆشەویستانی خۆی کە بەهرەمەندی کردوون، هەروەها زامن دەکات بۆی کە بیپارێزێت لە ڕێگەی ئەوانەی کە لێیات تورەیە (المغضوب علیهم)، هەروەها بیپارێزێت لە ڕێگەی گومڕایان (الضالین)، کە لایانداوە لە پەرستن و یەکتاپەرستی ئەو.

ئایا هیچ کات بیرت لەوە کردۆتەوە لەکاتێکدا کە فاتیحە دەخوێنیت ئەم وتانە لە وتەی ئێمە ناچن؟ زمانێکی سادە نیە وەك زمانی سادەی عەرەبی کە عەرەب قسەی پێدەکەن، تەنانەت کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) قسەی پێدەکرد لە هەموو ئەو فەرموودانەیدا کە پێمان گەیشتووە؟

هەر بۆیە هەوڵ بدە هەموو ئەو شتانەی کە باسمانکرد بیهێنیتەوە یادی خۆت لەکاتی خوێندنی فاتیحەدا، بۆئەوەی زیاتر ئاگات لە ماناکەی بێت و ڕۆحی وشەکان بەرجەستە بکەیت، هەوڵ بدە وا لەخۆت بکە وەك ئەوەی کە تۆ ئەو وشانەت داڕشتوە و لە ئەندێشە و عەقڵی تۆوە سەرچاوەیان گرتوە و بۆ خۆت داتناون بەبێ ئەوەی لە بیرت بچێ کە ئەمە وتەی خودای گەورەیە و معجزەیە و لە وتەی هیچ کەس ناچێت، کاتێك ئەوەت کرد، ئینجا ئەو هەستەت بۆ دروست دەبێت کە ئەم ئایەتانە لە ناختەوە هەڵدەقوڵێن و دڵت لێدەدات بۆیان و تۆ وشەگەلێك دەڵێی کە مەبەستتە، هەروەها چەند گوزارشتێك دەردەبڕی کە باوەڕت پێیەتی بەباوەڕبوونێکی ڕاست و دروست، تەنها چەند وشەگەلێك نین خەڵکانێك وتوویانە و زمانی تۆ دەیانڵێتەوە بەبێ ئەوەی هەستت ببزوێت و لە ماناکەی تێبگەیت.

ئەگەر لەم تاقیکردنەوەیە دەربچیت ئەوە کەوتویتە سەر سەرەتای ڕێگا دروستەکە و لەمەودوا دەتوانی نرخی هەموو یەکێك لە وشەکانی فاتیحە بزانیت و گەورەیی هەموو گوزارشتێکی تێبگەیت، هەوەها زۆر باشی و جوانی هەموو ئەو

مانایانە هەست پێبکەیت کە وشە و گوزارشتەکانی هەڵیانگرتووە و درک بکەیت بەو جیاکاریەی کە هەیەتی، لەڕووی کاریگەریی و تایبەتمەندی و ناوازەییەوە.

هەروەها هەمیشە لەبیرت بێت کە ئەم سورەتە گرنگیەکی تایبەتی هەیە بە جیاواز لە سورەتەکانی تری قورئانی پیرۆز، تۆ دەتوانی چەندت بوێت لەرکاتەکانی نوێژدا بیخوێنیت، بەڵام دەبێت سورەتی (الفاتحة) هەر هەبێت و بخوێنرێت ئەگەر هەموو قورئان لە نوێژەکەتدا بخوێنیت، پاشان فاتیحە نەخوێنیت ئەوە تۆ حیساب بکە کە نوێژت نەکردووە، ڕەنگە خێری خوێندنی قورئانت بۆ بنووسرێت، بەڵام خێری نوێژت بۆ نانووسرێت.

– ((لا صَلاةَ لِمنْ لَم يَقرَأ بِفاتِحةِ الكِتاب)) *{رواه البخاری، عن عبادة بن الصامت}*. واتە: (نوێژی بۆ نییە ئەوەی کە سورەتی فاتیحە نەخوێنێت).

## ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم)

بەڕاستی ئەم ئایەتە لە جوانترین ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزە ئەگەر بەرەهایی لە هەموویان جوانتر نەبێت، بەڵام دووبارەبوونەوە و ئولفەت پێگرتن و عادەتیبوون ئەم تایبەتمەندیەی تیایدایەتی لەبەر چاومان شاردۆتەوە، وامان لێهاتووە دەیڵێینەوە وەك ئەوەی وشە یان ڕستەی موجامەلەکردن وەك وشەکانی (سوپاس)، (عەفو)، (خوات لەگەڵ)، بەڵام ئایا پرسیارمان لە خۆمان کردووە کە بۆچی خودای گەورە هەڵیبژاردووە بۆ ئەوەی ببێتە یەکەم ئایەت کە دووبارەی بکەینەوە لە نوێژدا؟ بۆچی یەکەم ئایەتە کە قورئان دەستی پێدەکات؟ بۆچی یەکەم دەربڕینە لە ڕێیەوە دەچینە ناو هەموو سورەتێکەوە تەنها سورەتی (التوبة) نەبێت؟ بۆچی ئەم ئایەتە کراوەتە بەشێك لە سورەتی (الفاتحة)؟ دووبارەکردنەوەی (بسم الله) لە هەموو ئەم دەستپێکانەدا، پاشان وتنی لە دەستپێکی هەموو شتێکدا لە ژیانماندا (بەشێوەیەکی گشتی) وایلێکردوین کە بەهەڵە وا گومان دەبەین کە

تەنها ئایەتێکە هیچ مانایەکی نیە زیاتر لە سەرەتا یان دەستپێك بۆ کردنی کارێکی دیاریکراو، تەنانەت زانایانی زانستی (نحو) بەدوای ئێمەدا کەوتوونەتە ئەو هەڵەیەوە، خۆیان زۆر ماندوو نەکردووە بە تەقدیرکردنی ئەو فیعلە یان ئەو (حدث)ە ڕاستەقینەیەی کە جار و مەجرورەکە (بسم) پەیوەست دەکەن پێوەی، بۆیە وتوویانە ئەم ڕستەیە لە ئەصلدا ئاوایە (أبدأ باسم الله)، بەمە کێشە نەحویەکەی خۆیان چارەسەرکردووە، بەڵام لەسەر حیسابی ئەو مانا گرنگە ڕاستەقینەکە کە هەیە بۆ ئایەتەکە، لەڕاستیدا ئەم بابەتە ڕەهەندی زۆر دوورترە لەوەی کە تەنها دەستپێکردنی کارێك یان دەقێکی پیرۆز بێت لەلایەن خواوە، لەڕاستیدا دانانی (بسم الله) بە دەستپێکی هەموو سورەتێك و کارێك بە لەبەرچاوگرتنی مانا ڕاستەقینەکەی کە ئێستا باسی دەکەین وای لە ئێمە و زانایانی نەحو کردووە بکەوینە ئەو هەڵەیەوە.

ئەم ئایەتە وا ڕوو دەکات و ئاماژە دەدات و ئەمە گرنگترین ڕووتێکردن و ئاماژەدانە کە هەر ئاگادارکردنەوەیەکی قورئان کە دێت بەدوایدا، یان هەر فرمانێك و هەر بەرگریکردنێك، یان هەر بەڵێنێك، یان هەر ترساندنێك، یان هەر وەسفێك، یان هەر هەواڵێك، یان هەر ئامۆژگارییەك، یان هەر بیرخستنەوەیەك، ئەوە تەنها لەجیاتی خودای گەورە بە زمانماندا دێت و بە دەسەڵات و گەڕانەوە بۆ لای ئەو دەیلێین.

ئەگەر مرۆڤەکان جێنشینی ئەو بن لە زەویدا ﴿وإذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الأرض خليفة﴾ {البقرة: ٣٠}، ئەوە پێویستە لەکاتێکدا کە ئەو شان دەداتە پاڵ ئەم کارە گەورەیە: کە خوێندنەوەی وشە و دەربڕینەکانی ئەو زاتەن کە ئەویان بە وەکیل و جێنشین داناوە و زەوییان بەو سپاردووە، وشە و دەربڕینە ڕاستەکەی ئەو زاتەن (خوای گەورە)، لە وێنە ڕاستەقینەکەی ئەودا کە لە جیاتی ئەو دەریان دەبڕێت، ئەو کات پێویستە بە بیری خۆی بهێنێتەوە و بە بیری ئەو کەسانە

بهێنێتەوە کە گوێی بۆ دەگرن، کە کاتێك کە ئەو ئەم ئایەتانە دەخوێنێت و لەژێرەوەیە لەسەر زەوی ئەو ئایەتانەی کە لەلایەن سەروو خۆیەوە لە ئاسمان هاتوون و دەربڕاون، ئەوە ئەو (بسم الله) یە لەجیاتی ئەو دەڵێتەوە و بە گەڕانەوە بۆ ئەو ئەم کارە دەکات بە سیفەتی ئەوەی کە ئەو جێنشینی خودای گەورەیە لەسەر ئەم زەوییە.

کاتێك قازی حوکم دەکات لە بابەتێکدا کە لەبەردەستیدایە و دەست دەکات بە خوێندنەوەی بڕیارەکە دەڵێت (بەناوی گەلەوە)، گومان لەوەدا نییە کە ئەو لەکاتی ئەم دەربڕینەدا دەیەوێت بڵێت: ئەو حوکمەی کە دەریدەکەم من لەجیاتی گەل دەریدەکەم، یان (بەو سیفەتەی کە ڕاسپێردراوم لەلایەن گەلەوە کە هەستم بەم کارە)، ئەو لەو کاتەدا نوێنەرایەتی ئەو گەلە دەکات و دەسەڵات و بڕیارە پاڵپشت بە یاساکان لەوەوە وەردەگرێت، تۆش کاتێك هانا دێنیت بۆ یەکێك لە خزمەکانت بۆ ئەوەی داواکارییەکت بۆ ڕایی بکات پێی دەڵێیت: (بەناوی خزمایەتییەوە هانام بۆ هێناویت)، دیارە مەبەست ئەوەیە (بەهۆی دەسەڵات و مەرجەعیەت و بەرپرسیارێتی خزمایەتی) ئەم داواکارییەم هەیە.

کاتێك نوێژ دەستپێدەکەم بە (بسم الله) ئەوە مانای زەنگی ئاگادارکردنەوەیە بۆئەوەی ئاگادارم بکاتەوە بەوەی کە ئەم کارەی وا خەریکە ئەنجامی دەدەم تەنها هەندێك هەستان و دانیشتنی لەخۆوە نین، تەنها چەند خوێندنەوە و وتنی کۆمەڵە وشەیەکی لەبەرکراوی دوبارە نین یەك بەدوای یەك بە زماندا بێت و دڵ لێبدات پێی، بەڵکو پەیوەندییەکی ڕاستەقینەن لەگەڵ خوادا، تیایدا جەخت دەکەمەوە لەسەر ئەوەی کە ئەوەی کە ئێستا پێی هەڵدەستم بریتیە لە جێبەجێکردنی ئەو بەڵێننامەیەی کە لە نێوانماندا هەیە، من تا ئێستا و بە بەردەوامی ئەمینم لەسەر پلەی جێنشینیەکەی لەسەر زەوی.

هەروەها من کاتێك لاپەڕەی یەکەم لەم کتێبە دەڕازێنمەوە بە دەربڕینی (بسم الله الرحمن الرحیم) ئەوە بیرخستنەوەمە لەلایەن خودای بونیاتنەری جیهانەکان، جەختکردنەوەی منە بۆ ئەو کە هەرچی لە دووتوێی ئەم کتێبەمدا هەیە لە یەکەم وشەوە تا کۆتا وشە هەمووی بەپێی ئەو بەڵێننامەیەیە کە هەیە لە نێوانماندا لەوەی کە تەنها لەبەر ئەوە و پەیوەستم تیایدا بە یاسا و بنەماکانی ئەو و رادەوەستم لە سنوورەکانی ئەودا و سنوور نابەزێنم، پەیوەست دەبم بە مەرجەکانی ئەو دەسەڵاتەی کە پێم دراوە لەسەر زەوییەکەی.

(بسم الله) ئەو بەڵگەنامەیەیە کە لە نێوان خۆت و خودای گەورەدا هەیە، بەوەی کە تۆ زیاتر نیت لە وەکیلێکی ئەو لەسەر زەویدا، بۆیە هیچ موڵك و سامانێك نییە کە تەنها هی ئەو نەبێت، هیچ دەسەڵاتێك نییە کە تەنها دەسەڵاتی ئەو نەبێت، هیچ سەروەت و ماڵێك نیە تەنها ماڵی ئەو نەبێت، هیچ زەوییەك نیە تەنها زەوی ئەو نەبێت، تۆ ئەی مرۆڤ نەهاتویتە خوارەوە لە ئاسمان بۆ سەر ئەم پارچە دابڕاوە بچوکە کە ناوی (زەوی)یە کە لەنێوان چەندین ملیار لەم پارچە زەویە دابڕاوە گەورە و بچووکانەدا کە خودای گەورە بڵاوی کردونەتەوە لە بووندا تەنها بۆ مشورخواردن و بەڕێوەبردنی ئەو کارەی کە پێی سپاردوی لە کارەکانی ئەم پارچە دابڕاوە لەجیاتی ئەو وەك جێنشینی خاوەنە ئەسڵییەکەی، جێبەجێکردنی ئەم بەڵگەنامەیە وەك خۆی و بەپێی ئەم گرێبەستە کەم ماوەیە لە نێوان تۆ و ئەودا خەریکە ماوەکەی تەواو دەبێت، ئایا خۆت ئامادە کردووە بۆ بارکردن و ڕۆشتن، ئایا خۆت ئامادە کردووە بۆ ڕاوەستان و ئامادەبوون لەبەرامبەر خودای خاوەندار بە شێوەیەك کە دەفتەری حسابکردنەکەت بەدەستەوەیە؟

بەڵام چیرۆکی (بسم الله الرحمن الرحیم) لێرە کۆتایی نایەت، دەکرا ئەم (ڕێگە پێدانە) خودایییە، یان ئەو (وەکالەتە) بۆ جێنشینی، یان ئەو (عقد التمثیل)ە ڕابوەستێت لەسەر دەربڕینی (بسم الله) بەتەنها و بابەتەکە کۆتایی پێهاتبا، بەڵام

خودای گەورە بەم گرێبەستەوە هاوپێچێکی دانەبڕاوی تری لکاندووە و بە بەشێکی دانەبڕاو دادەنرێت لەم گرێبەستە، ئەویش: (الرحمن الرحيم)ە.

بەڕاستی کۆبوونەوەی هەردوو وشەی (الرحمن) و (الرحيم)، کە لە یەك چاوگەوە وەرگیراون و جەختکردن لە کۆکردنەوەی ئەم دوو سیفەتە لە سیفەتەکانی خودای گەورە لە (بسم الله)دا وەك (عقد التمثيل) وایە لە نێوان تۆ و خوادا، وتنی ئەم دوو وشەیە لەم سەرەتایە نائاساییەوە لەنێو گرنگترین هۆکارەکانی پەیوەندیکردنی مرۆڤ بە خوداوە: کە نوێژ و قورئان خوێندنە، لەناواخنیدا زۆر شتی بۆ هەڵگرتووین، بەڵکو بۆ تۆ ئەی نوێژخوێن بەتایبەت و بۆ جیهانی چواردەوریشت پتر لە یەك پەیامی هەڵگرتووە، لەوانە:

**یەکەم:** لەبەرئەوەی کە خودای گەورە (ڕەحمەتەکەی پێش تووڕەبوونەکەیەتی – سبقت رحمته غضبه) وەك لە فەرموودە قودسییەکەدا هاتووە، وا بۆی هەڵبژاردویت کە دەست پێبکەیت بەم دەربڕینە – الرحمن الرحيم–، بە جەختکردنێکی سەیر کە هاتنی لە پێش (١١٣) سورەتەوە ئەمە پشتڕاست دەکاتەوە، بەم دووانەییە جوانەی ناو ناوەکانی ئەگەرچی هەردوکیان لەیەکەوە نزیکن لە ڕووی پێکهاتەوە لە یەك چاوگ وەرگیراون لەگەڵ جیاوازییەکی ڕوون لە ماناکەیاندا.

بڕوانە خودای گەورە سەرەتای سورەتەکانی ڕەنگاوڕەنگ نەکردوە بەوەی دوان لە سیفەتە زۆرەکانی تری هەڵبژێرێت بۆ دەستپێکی هەر سورەتێك، تەنانەت نەهاتووە دوو سیفەت هەڵبژێرێت یەکێکیان ئاماژەی ڕەحمەت و میهرەبانی تێدا بێت و ئەویتریان قوەت و هێز و دەسەڵات بۆ هاوسەنگی ئەگەر بە دیدی مرۆڤانەی خۆمان بڕوانینە بابەتەکە، ئەگەرچی لەزۆر شوێنی قورئاندا بەم شێوەیە هاتوون، وەك ئەم دوو سیفەتە (العزيز الرحيم) {دخان: ٤٢}، یان ئەم دوو سیفەتەی تر (العزيز الغفور).

**دووەم:** لەبەرئەوەی هەردوو سیفەتی (الرحمن) و (الرحیم) ئەو گرنگیە گەورەیەیان هەیە و چونکە بەشێکی سەرەکین لە نوێژەکەت، دەستپێکی هەموو خوێندنەوەیەکن، ئەمە مانای ئەوەیە کە بەشێکن یان ڕووکنێکن لە عەقیدەکەت ئەگەر تۆ شایستە بیت بەو پلەیەی کە پێی گەورە کراویت کە: جێنشینی خودایە لەسەر زەوی.

**سێیەم:** چونکە بە ڕێگەپێدانی خۆی تۆ جێنشینی ئەویت لەسەر زەوی، ئەویش (الرحمن) و (الرحیم)ە، ئەمە ناچارت دەکات بەپێی ئەم دوو سیفەتە هەڵبژێردراوە باشانە لەلای خودای گەورە تۆش ببیتە باشترین جێنشین، بەردەوام لە بەرزبوونەوەی پلەکانتدا بێت، بە شێوەیەك کە گونجاوبێت لەگەڵ ئەو جەختکردنەوە بەردەوامە قورئانیانە یەکلەدوایەکانە سەبارەت بەم دوو سیفەتە، تا دەگەیتە پلەی بەرپرسیارێتی (الرحمة) کە پێتدراوە.

تۆ موسوڵمانیت کەواتە دەبێت جیهان لە لێبوردەیی ببینێت لە دەموچاوتەوە و لە بزەی لێوەکانتەوە و لە نەرمی دڵتەوە و لە پێڵوی چاوەکانتەوە و لە نزیك و دوورەوە و لە خۆشەویستیتەوە بۆ هەموان و بە لێبوردەیتەوە بۆ هاوڕێکەت و دوژمنەکەت وەك یەك، هەموو ئەمانە لە (الرحمن) و (الرحیم)ەوەیە کە چۆن باوەشدەکاتەوە بۆ بەرامبەر و دەگرێتە خۆی و لە دەربڕینی لێبوردەیی و خۆشەویستی و مرۆڤدۆستی و نەرمونیانی و (لین الجانب) و باڵ ڕاخستن (خفظ الجناح)دا دەبێتە پێشەنگ.

باشە ئایا ئەو وێنەیە کە موسوڵمانی ئەمڕۆ پێشکەشی دەکەن و جیهان دەیبینێت، ئایا ئیسلام ئەو وێنەیەیە؟!

## الرحمن الرحيم

ئەم دوو وشەیە لە زمانی عەرەبیدا هەریەکەیان کێش (وزن)ێکی جیاوازی هەیە: لەسەر کێش (وزن)ی: (فَعْـلان) و (فعیل)ن، بەڵام لە یەك چاوگەوە وەرگیراون ئەویش (الرحمة)یە، واقیعی زمانەوانی هەریەکەیان ئاماژە بەوە دەدات کە هەریەکەیان خاوەنی کەسایەتی مەعنەوی تەواو جیاوازبێ لەوی تر، چونکە وشەی (الرحمن) لەسەر کێشی (فعلان)ە، ئەویش داڕێژراوێکی ساتەوەختیە ئاماژە دەدات لە زمانی عەرەبیدا بەوەی کە ئێستا ڕوو دەدات، وەك چۆن وشەکانی (ظمآن – تینوو) و (غضبان – تووڕە) و (سهران – شەونخون) و (فرحان – دڵخۆش)، ئێستا ئەم وشانە هەموویان مانای سیفەتێکی کاتی دەبەخشن و ئاماژەن بۆ ئەو سیفەتە کە لەو کاتەدا ڕوو دەدات، بۆ نموونە (ظمآن – تینوو) واتە ئێستا ئاوایە تینووە، بەڵام تینوێتیەکەی نامێنێت لەماوەیەکی نزیکدا، (غضبان – تووڕە) واتە ئێستا تووڕەیە، بەڵام پاش کەمێکیتر لەسەرخۆ دەبێتەوە و تووڕەییەکەی نامێنێت.. هتد.

کەواتە (الرحمن) واتە میهرەبانییەکەی ئێستا لە ئاسمانەوە دێتەخوار بەسەرتدا، واتا لەم چرکەیەدا کە تۆ ئەم وشەیە دەخوێنیت، بەڕاستی مانایەکی سەروی شاقوڵی (عمودی) کاتیی هەیە کە درێژ بۆتەوە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی، لەگەڵیدا هەست بە میهرەبانی دەکەین کە دەجوڵێت بەرەو ڕوومان و بە نوێیی و چالاك و زیندوو لەلایەن خواوە دێت بۆمان، هەربۆیە سووربە لەسەر ئەوەی کە وا بیخوێنیت کە هەست بە دابەزینی بکەیت وەك تاڤگەیەك کە دەتشواتەوە بە فەیز و میهرەبانی خودایی لە تەپڵەسەرتەوە تا بنە پێت.

بەڵام (الرحیم) ئەوە لەسەر کێشی (الفعیل)ە، ئەویش سیفەتێکە زۆرکات لە زمانی عەرەبیدا ئاماژە بە بەردەوامی و درێژبوونەوە دەدات، بۆیە (الکریم –

بەخشندە) هەمووکات بەخشندەیە، (البخیل — چروك) هەموو کات چروکە، (الوضیع — نزم و بێ ڕێز) هەموو کات نزم و بێڕێزە.

کەواتە (الرحیم) هەمووکات و بە بەردەوامی و هەتاهەتایە میهرەبانە، میهرەبانی ئەو گشتییە، درێژدەبێتەوە بۆ زەمەنەکانی پێشوو و ئێستا و داهاتوو، ئەمە سیفەتێکە خاوەن ڕەهەندێکی ئاسۆیی دووروودرێژە، درێژ دەبێتەوە لە ئەزەلەوە بۆ هەتا هەتایی، بۆیە یەکتر تەواو دەکەن لەگەڵ سیفەتی (الرحمن) کە خاوەن ڕەهەندێکی (شاقوڵی— عمودی) بوو لە ئاسمانەوە درێژ دەبووەوە بۆ زەوی، خاوەن مانایەکی زیندووی جولاوە، کە هەرکات ئەم وشەیە بخوێنینەوە هەست بە تازەیی دەکەین.

*{بۆ درێژەی ئەم بابەتە بگەڕێرەوە سەر باسەکەمان سەبارەت بە (سورة الفاتحة) بەرگی دووەم لە کتێبی ((المعجزە))، واشنطن، المعهد العالمي للفکر الإسلامي، ٢٠١٦، ل٥٣٧ ..لاپەڕەکانی دواتر}.*

ئەوەی کە دڵ ئاسوودە دەکات سەبارەت بەم بابەتە و ڕەهەندەکانی ئەم دوو وشەیە و جیاکاری لە نێوانیاندا، ئەو ڕێگەیەیە کە پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر) ئەم دوو وشەیەی پێ دەخوێندنەوە، وەك لە فەرموودەکەدا هاتوو:

— (سئل أنس —رضی الله عنه—: کیف کانت قراءة رسول الله (صلی الله علیه وسلم)؟ فقال: کانت مدًا، ثم قرأ: (بسم الله الرحمن الرحیم) یمدّ بسم الله، ویمدّ بالرحمن، ویمدّ بالرحیم) *{رواه البخاری عن قتادە}*. واتە: (لە ئەنەس —ڕەزای خوای لێبێت— پرسیار کرا: خوێندنەوەی پێغەمبەری خودا چۆن بوو؟ فەرمووی: خوێندنەوەی بۆ ئایەتەکان بەدرێژکردنەوەوە بوو، پاشان ئەنەس بۆخۆی خوێندی: (بسم الله الرحمن الرحیم) (بسم الله)کەی درێژ کردەوە (الرحمن)ەکەی درێژ کردەوە و (الرحیم)ەکەی درێژ کردەوە).

درێژکردنەوەی (الرحمن) و (الرحيم) لەگەڵ ئەوەی هیچ یەك لە مەرجەکانی درێژکردنەوەیان تێدا نیە کە لە یاساکانی زانستی تەجویددا هاتوون کەسایەتییەکی سەربەخۆ و جیاواز دەبەخشێتە هەریەکەیان، چونکە (مدّ— درێژکردنەوە) واتا زیادبوونی کاتی وەستان لەسەر پیتەکان، ئەمەش واتا جیاکردنەوەی سیفەتی وشەکە لەگەڵ دوای خۆی، جیاکردنەوەش واتە سەربەخۆیی و تەنهایی.

## کلیلی سووری ژمارە (٢): إياك نعبد وإيــاك نستعـين

لەگەڵ مندا بە خەیاڵ بیهێننە بەرچاوی خۆتان وێنەی پیاوێکی ستەملێکراو کە چووبێت بۆ بەڕێوەبەرایەتیەکی میریی و بیەوێت مافی زەوتکراوی خۆی بسەنێتەوە، ئەم ستەملێکراوە دەبێ چی بکات؟ دیارە سەرەتا دەچێتە بەردەم کارمەندێکی تەرخانکراو لە بەڕێوەبەرایەتییەکە و داوای مافی خۆی دەکات، ئەویش پێیدەڵێت داواکارییەك بنووسە و وەسڵێك ببڕە، یان پولێکی لێبدە، پاشان دەیخاتە پۆستەی بەڕێوەبەرایەتییەکەوە بۆ ئەوەی ڕێچکەی ڕۆتینی ئاسایی خۆی وەربگرێت، ئەمە پێش ئەوەی بچێتە بەردەم بەڕێوەبەری یەکەم و ئەویش لێکۆڵینەوەی بۆ بکات و بڕیارێکی لەبارەوە بۆ بدات، جا ئەم بڕیارە ڕاست بێت یان هەڵە، دادوەرانە بێت یان ستەمکارانە.

حاڵی ئەم کابرایە بەراوردبکە بە حاڵی کەسێکی بەبەخت کە هاوڕێیەتیی یان خزمایەتییەکی بەهێزی هەبێت لەگەڵ بەڕێوەبەری ئەو بەڕێوەبەرایەتیە، ئەم بەڕێوەبەرە بەرپرسی یەکەم و کۆتا بێت کە لە کۆتاییدا بڕیار لەسەر داواکارییەکەی دەدات و خەمی حاڵەتەکەی دەخوات لەڕووی وەرگرتن یان ڕەتکردنەوەی داواکارییەکان، ئەو کەسێکی کاربەجێیە، تەنانەت ڕاستییەکانیش بەهەڵەیدا نایبەن.. بابەتەکە لەگەڵ (إياك نستعين) شتێکی لەو جۆرەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەراورد ناکرێ، خودای گەورە بەرز و باڵاترە ـ ولله المثل الأعلى ـ.

لەلای خودای گەورە کارمەندی بچووك نییە داواکارییە فەڕمییەکانت لە ڕێیانەوە بەرز بکەیتەوە، لەجیاتی ئەوە، ڕێگەت پێ دەدرێ، بەڵکو فەرمانت پێ دەکرێ ڕاستەوخۆ بۆ خۆت قسەی لەگەڵ بکەیت و داواکارییەکەت لە خۆی داوا بکەیت، لەوەش گەورە و گرنگتر، بۆ خۆی فێرت دەکات چۆن داوای بکەیت، کام وشە و داڕشتنە بەکاربێنیت بۆ هەرشتێك کە داوای دەکەیت، هەربۆیە هەموو ئەو سیفەتانەی کە داویەتە پاڵ خۆی لە سەرەتای فاتیحەدا دێنێتە سەر زمانت، پاشان ڕێگەت پێدەدات لە کۆتاییدا دڵنیایی بدەیت لەسەر ئەوەی کە تۆ بەندەی ئەویت و ئەویش پەروەرێن و پەرستراوی تۆیە بەرپرسیارە لە تۆ و لە رەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانت (إياك نعبُد)..

پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) دەفەرموێ، خودای گەورە دەفەرمێت: ((قَسَمْتُ الصَّلاةَ — أيِ الفاتِحَةُ، بَيْنِي وبَينَ عَبْدي نِصْفَين، فَنِصفُها لِي ونِصفُها لِعَبدِي، ولِعبدِي ما سَأَل. إذا قالَ العَبدُ (الحَمْدُ لله رَبِّ العالَمِين) قالَ حَمَدَني عَبْدي وإذا قال (الرَّحمنِ الرَّحيم) قال أثنى عَليَّ عَبدِي، فإذا قال (مالِكِ يَومِ الدِّين) قالَ مَجَدَني عَبدِي، فإذا قال (إيّاكَ نَعبُدُ وإيّاكَ نَستَعِين) قالَ هذا بَينِي وبَينَ عَبدي ولعَبدِي ما سَأَل، فَإذا قالَ (إهدنا الصِّراطَ المُستَقيم، صِراطَ الّذينَ أنعَمتَ عَلَيهِم غَيرِ المَغضُوبِ عَليهِم ولا الضّالِّين) قالَ هذا لِعَبْدِي ولِعَبدِي ما سَأَل)) *{رواه مسلم عن أبي هريرة}*. واتە: (نوێژ لە نێوان من و بەندەکەمدا دابەشکردوە، نیوەی بۆ من و نیوەی بۆ بەندەکەم، بۆ بەندەکەشم فەراهەم دێنم هەرچی داوا بکات، هەرکات بەندەکەم وتی: (الحَمْدُ لله رَبِّ العالَمِين) دەڵێ: بەندەکەم حەمد و سوپاسی کردم، ئەگەر وتی (الرَّحمنِ الرَّحيم) دەڵێم: بەندەکەم پێیدا هەڵدام، سوپاسگوزار بوو لەسەر نیعمەتەکان، ئەگەر وتی (مالِكِ يَومِ الدِّين) دەڵێ بەندەکەم بەبەرز و گەورەی دانام، ئەگەر وتی (إيّاكَ نَعبُدُ وإيّاكَ نَستَعِين) دەڵێ: ئەمە لە نێوان من و بەندەکەمدایە، بۆ بەندەکەشم فەراهەم دێت هەرچی داوا بکات، ئەگەر وتی (إهدنا الصِّراطَ المُستَقيم،

صِراطَ الّذينَ أَنعَمتَ عَلَيهِم غَيرِ المَغضُوبِ عَليهِم ولا الضّالِّين) ئەمە بۆ بەندەکەمە، بۆ بەندەکەشم فەراهەم دێت هەرچی داوا بکات).

ئێمە ئێستا لەو ئایەتەداین کە دەکەوێتە ناوەڕاستی سورەتەکەوە، تەنانەت ناوەڕاستی ئایەتەکە ناوەڕاستی سورەتەکەشە، لەو شوێنەی کە هەڵوێستێکی جەختکردنەوەی تەسبیحاتی بەگەورەزانین بەرزی دەکاتەوە بۆ لای خودا (إیاك نعبد)، راستەوخۆش هەر لەو ئایەتەدا هەڵوێستێکی نزایانە و پەنابردنیانەی جیاواز هەیە، داوا لە خودا دەکات ئەوەی هەموو ئەو شتانەی کە دەیەوێت: (إیاك نستعین).

بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئەم سەربەخۆییە سەرسوڕهێنەرە بۆ هەردوو وێستگە جیاوازەکە کە یەك ئایەت کۆیان دەکاتەوە، هەست دەکەین وەك ئەوەی کە پێویستە لەسەرمان رابوەستین لە نیوەی یەکەمی ئایەتەکەدا (إیاك نعبد)، پاشان نیوەی دووەم تەواو بکەین (وإیاك نستعین)، بەڵکو ریوایەتکراوە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە (رەزای خوای لێبێت) لە خوێندنەوەی وشەی (نعبد)دا دالەکەی بە تێری بخوێنینەوە تا ئەوەی واوێکی لێپەیدا ببێت. *{شاهین عبد الصبور. تأریخ القرآن، القاهرة، دار القلم، ١٩٦١، ص:١٧٥}*، ئەمەش یارمەتیمان دەدات لەسەر دەرخستنی سەربەخۆیەتی و چەسپاندنی کەسایەتی جیاوازی ئەوەی کە لە پێش مەدەکەوە دێت لەوەی کە دوای مەدەکەوە دێت.

ئایا هەستت کردووە کاتێك ئەم ئایەتە دەخوێنیتەوە کە تۆ لەبەردەم دوو هەڵوێستەی جیاوازدایت و ئەو شێوەزارەی کە بەشی یەکەم (إیاك نعبد)ی پێدەردەبڕیت دەبێ جیاواز بێت لە شێوەزاری بەشی دووەم (وإیاك نستعین)؟ تۆ بەبەشی یەکەمی تایبەت بە گروپی یەکەم لەم گرێبەستەوە دەچیت بۆ بەشی دووەمی تایبەت بە گروپی دووەم.

(إياك نعبد) دەڵێیت و لە دەنگتدا نەبرەکانی ڕێز و گەورەیی و ملکەچی و پڕ ترسی دەردەبڕیت بۆ کەسێك کە ناوچەوان و ژیان و داهاتووی تۆی بەدەستە، بەڵام کاتێك (وإياك نستعين) دەڵێیت لە دەنگتدا نەبرەی لاوازیی و پەنابردن و ملکەچی و ئومێد دەردەبڕیت، بەشێویەك هەست بە ڕژانی نمەی بارانی وەڵامدانەوە و میهرەبانی و فریاکەوتن و یارمەتی دەکەیت کە دەڕژێت بەسەرتدا لەلایەن ئەو یارمەتیدەرە بەهێزەوە، چۆن نا، ئێستا لەبەردەمتدایە و قسەی لەگەڵ دەکەیت و گوێت بۆ دەگرێت، ئەو بەتوانایەی کاتێك دژت بوەستێت کێت لەگەڵ دەمێنێت! ئەگەر لەگەڵتدا بێت کێ هەیە دوژمنت بێت وەك پێشینان فەرموویانە؟!

بەڵێ ئەوە ئەو ئایەتەیە کە خودا دابەشی کردووە لەنێوان خۆی و بەندەکانی، کە بەهۆیەوە جوانترین بەڵێن بە نوێژخوێن دراوە، لەلایەن راستگۆترین بەڵێندەرەوە کە بەڵێنی (ولعبدي ما سأل)ە، واتە بۆ بەندەکەشم فەراهەم دێت هەرچی داوا بکات.

(وإياك نستعين) وا بخوێنە کە دڵنیای وەڵامدانەوەی دوعاکانت بیت، بە شێوەی ئەو دڵنیایی ئەو موسوڵمانەی کە لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا چوو بۆ نوێژە بارانە لەگەڵ خەڵکدا، بەڵام بەتەنها ئەو چەترەکەی خستبووە بن باڵی بۆ بارانەکەی دوای نوێژکردن.

## اهدنا الصراط المستقيم، صراط الذين أنعمت عليهم... ولا الضالين

ئێستا، دەرگاکانی سوپاسگوزاریت لێکرانەوە، تۆش سوپاسگوزاریت دەربڕی، دەرگاکانی ڕەحمەتت لێکرانەوە و داوای دابەزینیت کرد، هەلی داواکردنت بۆ هەڵکەوت و داواکارییەکانت پێشکەش کرد، خوای گەورە گەورەترین داواکاری هێناوەتە سەر زمانت، گەورەترین داواکاری کە مرۆڤ لەم ژیانەدا داوای بکات،

ئەویش: داواکردنی هیدایەت و ڕێنموییکردنە بۆ سەر ڕێگای ڕاست، ئایا هیچ شتێکی تر هەیە بەقەدەر لادان لەسەر ڕێگای ڕاست و ونکردنی ئەم ڕێگایە لێی بترسی؟

بێنە فکری خۆت، ئەگەر ئێمە دەوڵەمەند بین بەئەوپەڕی دەوڵەمەندی، زیرەك بین بەئەوپەڕی زیرەكی، لەشساغ بین بەئەوپەڕی لەشساغی، دڵخۆش بین بەتەواوی مانای دڵخۆشی، بەڵام نیعمەتی یەکتاپەرستی و هیدایەتی خوداییمان پێنەدرابێت، ئەوە ئەم شتانە چ سودێکی هەیە؟ دڵخۆشی دونیا؟ دڵخۆشی دونیا چ سودێکی هەیە ئەگەر بێبەش بیت لە دواڕۆژدا؟ سەد ساڵ یان هەزار ساڵ یان سەد هەزار ساڵ یان یەك ملیۆن ساڵ چ سودێکی هەیە لەبەرامبەر ژیانی دواڕۆژ؟ لەبەرامبەر چرکەساتێك لە ژیانی نەبڕاوە، بەهەشت بێت یان جەهەننەم؟.

ـ ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّى إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِنْدَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ﴾ {النور: ٣٩}. واتە: (ئەوانەی کە ڕێبازی کوفریان گرتۆتەبەر کردەوەکانیان وەك سەرابێك وایە لە بیابانێکدا بریسکە بداتەوە کەسێکی تینوو وابزانێت ئاوە هەتا دەچێتە سەری دەبینێت هیچ نییە (کاتێك بەخۆی دەزانێت ژیانی کۆتاییە و قیامەت بەرپا بووە) خوایش ئامادەیە لەلایدا و بەگوێرەی کردەوەکانی موحاسەبەی دەکات و لێی دەپرسێتەوە).

ـ ((يُؤْتَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا مِنَ الْكُفَّارِ، فَيُقَالُ: اغْمِسُوهُ فِي النَّارِ غَمْسَةً، فَيُغْمَسُ فِيهَا، ثُمَّ يُخْرَجُ، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: أَيْ فُلَانُ هَلْ أَصَابَكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا، مَا أَصَابَنِي نَعِيمٌ قَطُّ، وَيُؤْتَى بِأَشَدِّ الْمُؤْمِنِينَ ضُرًّا، وَبَلَاءً، فَيُقَالُ: اغْمِسُوهُ غَمْسَةً فِي الْجَنَّةِ، فَيُغْمَسُ فِيهَا غَمْسَةً، فَيُقَالُ لَهُ: أَيْ فُلَانُ هَلْ أَصَابَكَ ضُرٌّ قَطُّ، أَوْ بَلَاءٌ، فَيَقُولُ: مَا أَصَابَنِي قَطُّ ضُرٌّ، وَلَا بَلَاءٌ)). *{رواه ابن ماجة وصححه الألباني عن أنس بن مالك}.*

واتە: (لە ڕۆژی قیامەتدا خۆشگوزەرانترین کەسی سەردنیا دەهێنن، دەوترێ جارێك نوقومی بکەن لەناو ئاگردا، پاشان دەری دێنن، پێی دەڵێن: ئێ فلان کەس هیچکات خۆشیت بینیوە لە ژیانتدا؟ دەڵێ: نەخێر قەت تووشی هیچ خۆشییەك

نەبووم، پاشان موسوڵمانێك دەهێنن کە لە هەموو کەس زیاتر تووشی زەرەر و ناخۆشی و بەڵا و موسیبەت بووە، دەوترێ نوقمی بکەن لە بەهەشتدا، جارێك نوقمی دەکەن، پاشان پێی دەڵێن: ئێ فلان کەس قەت تووشی زیان و ناخۆشیی بوویت؟ دەڵێ نەخێر قەت تووشی بەڵاو ناخۆشیی و زیان نەهاتووم).

لەڕاستیدا ئەو چێژەی کە وەریدەگرین لە خوێندنی (وإياك نستعين) جیاوازە لە چێژی (اهدنا الصراط)ە، دەربڕینی یەکەم داواکاری دنیاییە، بەڵام دەربڕینی دووەم داواکاریی قیامەتییە، بەبێ ئەوەی ئەمە لە دەربڕینەکەدا دەربکەوێت، چونکە (اهدنا الصراط المستقيم) دەربڕینێکی کراوەیە دەکرێ لەگەڵ داواکاری هیدایەت و یەکتاپەرستی مەبەستمان کاربەجێیی و ڕێنمایی دنیایی و رای پەسەندیش بێت لە هەموو کارەکاندا، باشە هیچ نیعمەتێکی دنیایی باشتر هەیە کە مرۆڤ لەدنیادا نیعمەتی پەسەندیی و ڕێکی راوبۆچوونی هەبێت، کە پشتی پێببەستێت لە کارە دنیاییەکانیدا و یارمەتی ئەوانی تری پێبدات لە چواردەوری.

ئەم خەسڵەتە "کراوەیە"ی کە لە وشەی (الصراط)دا هەیە لە سورەتی (الفاتحة)دا، کورت هەڵنەهاتووە لەسەر ڕێگەی تاقمێك یان ئاینزایەك، ئەگەر دیقەت بدەین لە کراوەیی هەردوو دەقی (الذين أنعمت عليهم) و (المغضوب عليهم) کێن ئەمانە؟ هەروەها (ولا الضالين) کێن؟ دەبینین هەموویان بە کراوەیی ماونەتەوە و دیاری نەکراون، ئایا بە ڕیز ئەوانە: موسڵمانان، پاشان جولەکە، پاشان گاورەکانن، وەك هەندێك لە زانایانی تەفسیر راڤەی دەکەن؟ هەروەها وەك لە هەندێ فەرموودەی راستدا هاتووە:

- ((المَغْضُوبِ عَلَيْهم" اليَهود "الضّالّين" النَّصارى)) *{صححه الألباني في السلسلة الصحيحة عن عدي بن حاتم الطائي عن أبي ذر الغفاري}* .

واتە: (ئەوانەی "بەر تووڕەیی خودا کەوتوون" ئەوە جولەکەن و ئەوانەی "گومڕابوون" ئەوە گاورەکانن).

لەڕاستیدا ئەم سێ دەربڕینە لە ڕووی زمانەوانییەوە یەکتر تەواو دەکەن، هیچ بۆشاییەکی زمانەوانی هەڵناگرن لە دوای خۆیانەوە کە تەنها دابڕێن بەسەر تاقم یان کۆمەڵێکدا، بەڵام ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ دەربڕینە بەشەرییەکان بە تەواوەتی خەسڵەتی کراوەیی ئەم "سێ" دەربڕینە هەست پێدەکەین.

لەگەڵ مندا جارێکی تر ئایەتەکە بخوێنەرەوە، بەڵام بەگۆڕینی دەربڕینە کراوەکان بە دەربڕینی تری داخراو بۆ ئەوەی جیاوازییەکان بەڕوونی ببینیت لەنێوان هەردوو شێوازەکەدا:

(خوایە ڕێنماییمان بکە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست، ڕێگەی موسوڵمانان، ڕێگەی جولەکە و گاوران نا).

ئێستا بۆتدەرکەوت دەربڕینە قورئانییەکە چەند کراوەترە لەم دەربڕینە؟ ئایا بۆت دەرکەوت کراوەیی (الذين أنعمت عليهم) هەموو چاکە لەگەڵکراوەکان دەگرێتەوە و کراوەیی (المغضوب عليهم) هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە خودا لێیان تووڕە بووە، مانای (ولا الضالين)یش هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە گومڕابوون و ڕێگەی ڕاستیان ونکردووە، ئەمە هەمووی بەبێ ئەوەی ڕاڤەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا وەلا بنێین کە باس لە جولەکە و گاورەکان دەکات، هەروەها بەبێ ئەوەی سنووری ئەم سێ دەربڕینە دابخات و کورتیان هەڵبێنێت لەسەر تاقمێکی دیارکراو، وەك ئێمە لە دەربڕینە مرۆڤانەییەکانماندا کردمان؟

زۆر گرنگە کاتێك ئەو ئایەتەی (اهدنا الصراط المستقيم) دەخوێنین، بیرمان بێتەوە لەبەر چ حیکمەتێکی خودایی لەنێوان چەندین ئایەتی هاوشێوەی تردا کە دەیخوێنین لە نوێژەکانماندا ئەم ئایەتە بەکراوەیی هاتووە بۆمان، بەشێوەیەك دەتوانین وشەی (اهدنا) ئەوەندە بەکراوەیی بڵێین کە هەموو دروستکراوێك بگرێتەوە لەسەر زەوی، دەشتوانین ئەوەندە تەسکی بکەینەوە کە لە خۆمان تێنەپەڕێت، ئەم وشەیە بەشێوەی تاك نەهاتووە، بەڵکو بەشێوەی کۆ هاتووە، بۆیە

لەدوای ئەوەی ئەم راستیەتان بۆ دەرکەوت هەوڵی تەواو بدەن لەکاتی خوێندنی ئەم نزایەدا هەموو کوڕ و کچ و خێزان و خزم و کەس و دراوسێ و ناسیاوەکانتان بە ئامانج بگرن و نزای هیدایەت بۆ هەموویان بکەن، بەڵکو با نزاکەتان هەموو جیهان بگرێتەوە لە دۆست و دوژمنانتان وەك یەك، موسوڵمان و ناموسوڵمان.

ئایا جوانترین و بەقیمەتترین و گەورەترین شت هەیە لەوە باشتر بێت کە داوا لە خودای باڵادەست بکەیت چاکەی خۆی ببارێنێت بەسەر دۆست و دوژمندا، بەوەی هەموو مرۆڤەکان بەگشتی وەك یەك هیدایەت و رێنمایی بکات بۆ سەر حەق و دادپەروەری و رێگەی راست؟

لە بیرت نەچێت شکاندنی بەربەستەکانی بەکارهێنانی راناوی (نا)ی زمانی عەرەبی لە وشەی (اهدنا)دا و هەڵبژاردنی ئەم راناوە بۆ ئەوەی هەمووان بگرێتەوە بەبێ هەڵاوێران، شکاندنی بەربەستەکانی رق و قینە لەنێوان خۆت و ئەویتردا، جا هەرکەسێك بێت ئەویتر، بانگکردنە بەئاشکرا و بڕیاردانێکی جێگیرە و پڕۆڤەکردنێکی بەردەوامە لەسەر بەرزکردنەوەی ئاڵای خۆشەویستی و لێبوردەیی لە دەروونتدا بەرامبەر ئەوانەی کە بەردەوام ئاڵای رق و کینە بەرز دەکەنەوە، منداڵەکانیان هەر لە شیرەخۆرییەوە رادەهێنن لەسەر ئەوەی کاتێك ویستیان موسوڵمان بن خاوەن رق و کینە بن، هەموو کات ئەو یاسا زێڕینەت لە یادنەچێت: تۆ موسوڵمانیت، کەواتە تۆ خەڵکت خۆش دەوێت و لێبوردەیت، خوای گەورە دەفەرموێت:

ـ ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾ {الأعراف: ١٩٩}. واتە: (کاری ئاسان لە خەڵکی داوا بکەو چاوپۆشی لە هەڵە و کەموکوڕییەکانیان بکە و فەرمان بدە بە چاکە و کردەوەیەك کە پەسەندی شەرعە، ڕووش وەرگێڕە و پشت بکە لە نەفام و تێنەگەیشتووان).

ـ ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾ {الشورى: ٤٠}. واته: (ئەو کەسەی لێخۆشبوونی هەبێت و چاوپۆشی و چاکسازیی بکات، ئەوە پاداشتی لای خوایە، بەڕاستی خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت...).

ـ ﴿وَإِنْ تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ {التغابن: ١٤}. واته: (ئەگەر چاوپۆشی لە هەڵەیان بکەن و واز لە ئازاردانیان بهێنن و لێیان ببورن، ئەوە چاك بزانن کە خوا لێخۆشبووە و میهرەبانە).

## وێستگەکانی درێژکردنەوەی (المدّ) لە (الفاتحە)دا[1]

ئەگەر درێژکردنەوە (المدّ) بریتیبێت لە راوەستانێکی کەم، ئەوە زۆر ئاساییە کە بەهۆی ئەو هەناسە زیادەیەوە لە ڕووی کاتەوە کەسایەتییەکی تایبەت ببەخشێت بە وشەکە یان دەربڕینەکە، هەروەها وزیەکی بەهێزی لە سەربەخۆبوونی پێببەخشێت، چونکە ئەو بۆشاییە زەمەنییە وەك باسمانکرد مانای کات و مۆڵەتێکی سەوزی زیاترە بۆ بیرکردنەوە، بۆ جێبەجێکردنی ئەو وشە یا دەربڕینانەی کە درێژکردنەوەی (مدّ)ەکەی تێدایە.

پێویستە لێرەدا جیاوازی بکەین لە نێوان راوەستانی تەواو لە خوێندنەوەدا و درێژکردنەوەی پیتێك لە پیتەکانی وشە، کە ئەویش جۆرێکی تایبەتە لە راوەستان یان بڵێین وەك راوەستان وایە، پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) لە پێش خوێندنی فاتیحەدا و لە دوای تەواوبوونیشی بەتەواوی رادەوەستا، هەروەها لە کۆتایی هەر ئایەتێکدا رادەوەستا، ئەمەش مانای بۆشاییەکی سەوزی ترە کە دوو ئایەت لەیەکتر جیا دەکاتەوە، بەڵام راوەستانەکانی درێژکردنەوە (المدّ) یاخود

---

[1] ئەم بابەتە ناسازە لەگەڵ بنەما چەسپاوەکانی بابەتی درێژکردنەوە(مدّ) لە کتێبەکانی زانستی جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز (علم التجوید) وەرگێڕ.

باشترە بڵێین هاوشێوەی ڕاوەستانەکان ئەوانەن کە دەکەونە نێوان وشەی ئایەتەکان، بەوەی کە هەڵگری درێژکردنەوەی کات و هەڵوێستەی زیاترن دەکرێ ملکەچی و بیرهێنانەوەی مانای ئایەتەکانی قورئان و جێبەجێکردنیان زیاد بکەن، دەکرێ بۆشایی سەوزی کاتیمان بۆ دەستەبەر بکەن، کە هاوکار دەبێت بۆ بیرکردنەوەی زیاتر لە مانا و وشەکانی پێشوو، ئامادەمان دەکات بۆ وەرگرتنی مانای وشەکانی دوای خۆی، بۆیە لە هەر (٢٩) وشەکەی سورەتی (الفاتحة)دا (٢١) درێژکردنەوەی لەفزی هەیە، بێجگە لە شوێنی ڕاوەستانە ئاساییەکان کە لە کۆتایی ئایەتەکاندان، کە ئەوانیش حەوت دانەن، ئەم وزە بەبەرداکردنە بەهێز و چڕەی لە درێژکردنەوەکاندا هەن لە سورەتی (الفاتحة)دا بە هیچ شێوەیەك لە زمانی قسەکردن و نووسینماندا نابینرێت، هەروەها لە زۆربەی سورەتەکانی تریشدا نابینرێت.

ئەم درێژکردنەوە یەك لە دوای یەکانەی ناو سورەتی (الفاتحة) زۆر کات هەندێکیان بەپێچەوانەی یاساکانی تەجویدەوەن، بەڵکو دەتوانین بڵێین فاتیحە تاکە سورەتە کە بەتەواوی پابەندی ئەو یاسایانە نییە، ئەمە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی سورەتی (الفاتحة)، ئەم درێژکردنەوە زۆرانەش بەم شێوەیە یارمەتی نوێژخوێن دەدات لەسەر ڕۆچوون لە بیرکردنەوە و تەسلیمبوون و ملکەچبوون و خۆبەکەمزانین بۆ ئەو کەسەی کە لەبەردەمیدا ڕاوەستاوە و نوێژ بەرەو ڕووی دەکات، کە خودای گەورەیە.

ئەگەر بەربژێرێك بکەین وەك نموونە لە دوو سورەت، لە دوو سورەتە هەرە کورتەکانی قورئان، کە سورەتی (الکوثر) و (الإخلاص)ن، دەبینین لە یەکەمیاندا درێژکردنەوەکان لە"سێ" دانە تێپەڕ ناکەن لە هەر دە وشەکانیدا، ئەوانیش لە وشەکانی (إِنَّا– أَعْطَيْنَاكَ – شَانِئَكَ)دان، لە سورەتی دووەمدا لە چوار حاڵەت تێپەڕ ناکات لە هەموو پانزە وشەی سورەتەکەدا، ئەوانیش لە وشەکانی (اللَّهُ– اللَّهُ– يُولَد– لَهُ)دان.

زۆر گرنگە لێرەدا ئەوە بیر بهێنینەوە کە هەموو ئەو شتانەی کە لەم کتێبەدا نووسراون، بریتین لەو شتانەی کە بە دڵدا دێن و (خواطر) و شرۆڤە و شیکردنەوە و پێشنیازن، لەڕاستیدا لە بیروبۆچوونی مرۆڤانە تێپەڕ ناکەن، شایانی هەڵوەشاندنەوە و پێداچوونەوەن، بۆیە ئەگەر بە بەڵگە و دەق پێچەوانەی ئەم بیروبۆچوونانە سەلمێنرا ئەوە ئەوکات لەگەڵ دەقەکاندایین، موسڵمانیش نابێت هیچکات بەمشێوەیە نەبێت.

## سەنتەر بوونی ڕکووع و سوژدەکان

کاتێك بۆ یەکەمجار حەجم کرد لە تەمەنی چل ساڵیدا بووم، وەها خۆم بینییەوە وەك منداڵێکی بچووك لە کاتێکدا کە تەوافم دەکرد بە دەوری کەعبەدا، دوو پارچە جلی سادەم پۆشیبوو، لەو کاتەدا شەیتان وەسوەسەی دڵمی دەدا: سەیر دەبێت یەکێك لە خوێندکارە زانکۆییەکانت بەم شێوەیە بتبینن کە موسوڵمان و ناموسوڵمانیشیان تێدایە؟

دەڵێن ئەوە مامۆستاکەمان چی بەسەرهاتووە؟ ئەمە بوو کە هەمدەم لەبەردەمماندا بە کەشخەیی و ویقار و باوەڕبەخۆبوون و ڕۆشتن و جوڵەی لەسەرخۆ و قورس ڕاهاتبوو؟!

بەڵام بەهۆی ڕژانی فەزڵی خودا بەسەرمدا بای ڕۆحی ئیمان و بەندایەتی خاوێن هەڵیکرد بەسەرمدا زۆر بە خێرایی ئەو ئاگری وەسوەسەیەی کوژاندەوە و بیریخستمەوە کە: من موسوڵمانم.

بەڵێ من موسوڵمانم واتا من تەسلیم بووم، من ملکەچ بووم، من زەلیلم، من زەعیفم، من بەندەم یان باشترە بڵێم هیچ شت نیم لەبەرامبەر ئەو خودا عەزیز و جەبار و موتەکەبیرەدا، ئەوەی خاوەندارێتی ئاسمانەکان و زەوی دەکات، زیندوو دەکاتەوە و دەمرێنێت، بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

ئەم کۆمەڵە نەسیمە ڕۆحانیە بەرزانە وایان لێهات هەڵیان دەکرد بەسەرمدا هەر کاتێك نەفسی خۆم زەلیل کردبایە بۆ خودای گەورە لە هەموو پەرستشێك لە پەرستشەکانمدا، وایلێهات بەردەوام ببوە هاوڕێ لەگەڵم لە هەموو کووڕبوونەوەم بۆ ڕکوعێك، بۆیە پاك و بێگەردی خودای گەورەم دەکرد (سبحان ربي العظيم) لەو هەموو لاوازی و ستەم و کەمتەرخەمی و ماندووبوون و غافڵی و... کە هەمبوون. پاشان بەهەمانشێوە لە هەموو هەستانەوەیەکدا لە ڕکوع لەو کاتەی کە ئەو یاسا زێڕینە خوداییەم بە بیر دەهاتەوە (سمع الله لمن حمده) و منیش سوپاسم دەکرد و دەمووت: (ربنا لك الحمد) لەسەر ئەوەی کە دروستت کردوم و هیدایەتت داوم و پێتبەخشیوم و...، پاشان بەهەمانشێوە لە هەموو دابەزینێکم بۆ سوژدە بۆ ئەوەی دووبارە پاك و بێگەردی بکەم (سبحان ربی الاعلی) و خودای گەورە بە دوور بگرم لە فلاّن و فلاّن و فلاّن...هتد ئەو کەموکوڕیانە، تا وام لێهات بەردەوام ئەو هەستەم بۆ دروست بووبوو بە گوفتار و کردار هەمیشە ئەوکاتانەی سەرم لە لاشەم بۆ خودا نزمتر بوو، نزیکتر بووم لەوەوە، لەوێ لە ئاسمان.

– ((لَقِيتُ ثَوبان مَولى رَسولِ اللهِ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسلَّم) فَقُلتُ أخبِرني بِعَمَلٍ أعْمَلُهُ يُدخِلُني اللهُ بِهِ الجَنَّةَ، أو قال قُلتُ: بِأحَبِّ الأعمالِ إلى اللهِ، فَسكتَ، ثُمَّ سَألتُه فَسَكتَ، ثُمّ سَألتُه الثالِثَةَ فَقالَ: سَألتُ عَنْ ذلِكَ رَسولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقالَ: عَلَيكَ بِكثْرةِ السُّجودِ لِلهِ فَإنَّكَ لا تسجُد سجدَةً إلا رَفعَك اللهُ بِها درَجةً وحطَّ بِها عَنكَ خَطيئَةً..)) *{رواه الشيخان، عن معدان بن طلحة}*.

واتە: (گەیشتم بە (ثوبان) ئازادکراوی پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) پێم وت کارێکم پێ بڵێ کە خودا بە هۆیەوە بمخاتە بەهەشت، یان وتم کارێکم پێ بڵێ لەلای خودا لە هەموو شتێك خۆشەویستتر بێت؟ بێدەنگ بوو، پاشان پرسیارم لێ کردەوە و ئەویش بێدەنگ بوو، بۆ سێیەمجار پرسیارم لێ کردەوە وتی: لەم بارەیەوە پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێ)

کردووه، فەرموویەتی: ئاگات لێ بێ زۆر سوژدە ببە، چونکە تۆ هیچ سوژدەیەك نابەیت بۆ خودا ئیلا خودا بەهۆیەوە پلەیەك بەرزت دەکاتەوە و تاوانێك لەسەرت ڕەت دەکاتەوە).

هیچ کات بە بیرتاندا هاتووە کە نوێژخوێنی وا هەیە کە دزی دەکات لەناو نوێژەکەیدا، لەنێوان ڕکوعێك بۆ ڕکوعێکی تر، لەنێوان سوژدەیەك بۆ سوژدەیەکی تر؟ لە هەمووی سەیرتر کە بەدیدەکرێت لەم دزانە ئەوەیە کە ئەمانە دزی ناکەن لە خەڵکی تر، بەڵکو دزی لە خۆیان دەکەن.

– ((ما تَرَونَ فِي الشّارِبِ و الزّاني و السّارِقِ؟)) – ذلك قبل أنْ تُنزَّلَ فِيهِمُ الحُدودُ – قالُوا: اللهُ و رَسولهُ أعلَمُ، قالَ: ((هُنَّ فَواحِشُ و فِيهِنّ عُقُوبَة وأَسوَأُ السَّرِقةِ الذِي يَسرِقُ صَلاتَهُ)). قالُوا: وَكَيفَ يَسرِقُ صَلاتَهُ؟ قالَ: ((لا يُتِمُّ رُكُوعَها ولا سُجُودَها)).{*صححه الألباني في صحيح الترغيب، عن نعمان بن مرة* }. واتە: (چی دەڵێن سەبارەت بە مەیخۆر و زیناکەر و دز؟ – ئەمە دیارە پێش هاتنە خوارەوەی سزای ئەمانە بووە – هاوەڵان وتیان: خودا و پێغەمبەری خودا باشتر دەزانن، فەرمووی: ئەوانە گوناهی ناشیرینن و سزا هەیە لەسەر یان، خراپترین دزییش دزیی ئەو کەسەیە کە نوێژەکەی دەدزێت. وتیان: چۆن نوێژەکەی دەدزێت؟ فەرمووی: سوژدە و رکوعەکانی تەواو ناکات).

بۆچی نا؟ باشە نوێژ بەخششی خودایی نییە و هاتۆتە خوارەوە بۆمان و (کتابًا موقوتًا) نییە و تیایدا دەستکەوتی ڕۆژانەمان ناگوێزێتەوە لە چەند کاتێکی دیاریکراودا هەموو ڕۆژێك چەند خودا بیەوێت لە خێر و چاکە بەهۆیانەوە دەخاتە سەر پەسمەندەی ڕۆژی دواییمان؟ بەڵام نوێژ لەلای زۆربەمان بۆتە ئامرازی بێ ئەرزش و کات بەفیڕۆدان، لەلای زۆربەمان ئەو نوێژە لە مافەوە بووە بە ئەرك، تەنها بریتیە لە جوڵاندنی ئەندامەکانی لاشە بەخێرایی و جوڵاندنی زمان بەخێرایی و گەشتنە کۆتایی نوێژەکە بەخێرایی.

– ((الصَّلاةُ ثَلاثَةُ أَثْلاثٍ: الطَّهُورُ ثُلُثٌ، والرُّكُوعُ ثُلُثٌ، وَالسُّجُودُ ثُلُثٌ فَمَنْ أَدَّاهَا بِحَقِّهَا قُبِلَتْ مِنْهُ وَقُبِلَ مِنْهُ سَائِرُ عَمَلِهِ وَمَنْ رُدَّتْ عَلَيْهِ صَلاتهُ رُدَّ عَلَيْهِ سَائِرُ عَمَلهُ)).

*{صححه الألباني في صحيح الترغيب عن أبى هريرة}* .

واته: (نوێژ پێکهاتووه له سێ بەش: پاك و خاوێنی بەشێکیەتی، چونه رکوع بەشێکی تریەتی، سوژدەبردنیش بەشێکی تریەتی، هەرکەس بەجوانیی مافی خۆی پێدا ئەوه لێی وەردەگیرێت و هەموو کردەوەکانی تریشی لێوەردەگیرێت، ئەوەی نوێژەکەی رەتکراوەیەوه بەسەریدا، ئەوه تەواوی کردەوەکانی تریشی رەتدەکرێتەوه).

ئەڵڵا، بڕوانه ئەگەر بۆ ڕکوع سێیەك هەبێت چی بۆ ئەوانیتر مایەوه کەواته؟!

ئایا تێبینیتان کردووه که ڕکوع و سوژده ئەو دوو جوڵەیەن له نوێژدا که فەرزکراون لەسەرمان، هیچ جوڵەیەکی تر نییه که فەرزکرابێت بێجگه لەم دوانه؟ چونکه به ڕاوەستان دەست پێدەکەین بەبێ جوڵە، کۆتایی پێدێنین به دانیشتن بەبێ جوڵە، بۆیه لەنێوان ئەم دوو بێ جوڵییەدا تەنها دوو جوڵەی ڕکوع و سوژدەمان هەیه، تێبینیمان کردووه جەختکردنەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر) له هەردوو ڕکوع و سوژدەدا لەسەر کۆکردنەوەی ((جوڵە)) لەگەڵ ((بێدەنگیی))؟ بۆیه بەڕاستی دەبینین هەر جوڵەیەکمان له نوێژدا لەگەڵیدا عیبادەتێکی کراوەی هاتووه که پێویست دەکات لەسەرمان له دوای وتنی هەڵوێستەکردن و ڕاوەستان و بێدەنگی و بیرکردنەوه.

بڕوانه کاتێك ئێمه (الله أكبر) دەڵێینەوه سروشتی کراوەییەکەی به واتای بێدەنگیی و هەڵوێسته و بیرکردنەوەیەکی کەم دێت: خودا به گەورەزانین له چی؟

کاتێك ئێمه (سبحان ربي العظيم) و بەدوایدا (ربنا لك الحمد) دەڵێینەوه، دەبینین سروشتی کرانەوەیی هەردووکیان وەك پێشوو مانای بێدەنگیی و هەڵوێسته و بیرکردنەوەیەکی کەم دەهێنێ له دوایاندا: به بێگەردی بزانین له چی؟

لێرەوەیە کە بۆمان دەردەکەوێت کە بەشی ڕکوع و سوژدە سێیەکی نوێژەکەیە، بۆیە ئامادەی بکە لە دەروونتدا هەر شتێك کە دەزانیت یارمەتیت دەدات لەسەر بیرهێنانەوە و ئامادەبوون و گەورەیی خودای گەورە لەگەڵ دوبارە وتنەوەی (سبحان ربي العظيم)، یان (سبحان ربي الأعلى)..

هەوڵبدە تەسبیحاتەکانی ناو نوێژەکەت و هەموو نوێژەکەت بکە بە پەرستش نەك بیکەیت بە عادەت.

ئەگەر وتنی (الله أكبر) فرسەتی تۆ بن بۆ خۆ بەئارامگرتن و بۆ ئەوەی خۆتی پێ بەهێز بکەیت لەسەر هەموو ئەو شتانەی ڕووبەڕووت دەبنەوە لە ژیاندا لە قورسایی و تەنگانەیی و وتنی (الحمد لله رب العالمين)، هەروەها (ربنا لك الحمد) فرسەتی تۆ بن بۆ بیرهێنانەوە و ئامادەکردنی دەروونیی بۆ نیعمەتەکانی خودا و فەزڵی لەسەرت، ئەوا (سبحان ربي العظيم) و (سبحان ربي الأعلى) فرسەتی تۆن بۆ (وردبوونەوە) بۆ (بیرکردنەوە) لە گەورەیی خودا و دروستکەریی و داهێنانی.

بۆیە سوود لە نوێژەکەت وەربگرە بۆ دونیا و دوارۆژت، لەوانەبە کە کاتێك سوژدە دەبەن و دەمەکانیان روو لە پاك و بێگەردیی خودای گەورە دەکەن و لەگەڵیدا لاشە و ئەندامەکانیان و لەش و ئەقڵ و دڵیان سوژدە دەبەن و تەسبیحات دەکەن.

## کلیلی سووری ( ٣ )

## التحیات لله – سڵاوی ڕێــزدارانە بۆ خودا

ئایا بەتەواوی هەستت بە مانای سڵاوی ڕێزدارانە کردووە لە زاتی خودای گەورە؟ بەهای ئەوەت هەست پێکردووە کاتێك تۆ بەدانیشتنەوە لەبەردەم خوادا و ئەو لەسەر عەرشەوە سەیرت دەکات لە کۆتا مەقامی خوداییەوە کە بەهەشتیش لەوێیە دەڕوانێتە تۆ کە دانیشتوی؟ ئایا بەهای ئەوەت زانیوە کە لەو کاتەدا تۆ پێی دەڵێیت: التحیات لله – سڵاوی پڕ ڕێز و شکۆمەندیت لێ بێت خوایە؟

ئەو هەنگاوانەی پێش تەحییات ناوتن هەموویان چەند قۆناغێکی ئامادەکاری بوون بۆ یارمەتیدانت لەسەر بردنەوەی ئەم ساتە گەورەیە، بۆ بەخشینی وزەیەکی ڕۆحی تەواو بووە کە بتوانێت ئەو هەموو ڕێگە و بەرگە گەردوونیە ناکۆتاییانەت پێ ڕاوبکات، بۆ ئەوەی ئامادەت بکات بۆ ئەو ڕاوەستانە نائاساییە، ئەو پاداشتە نائاساییە کە بریتیە لە: سەلام و ڕێزنواندن بۆ خودای گەورە.

ئەرێ چ هەڵوێستێکی گەورەیە نەفس و دەروونی خۆتی تێدایە کە لەو چرکەساتەدا بژیت بەتەواوی ڕەهەندەکانیەوە، هەستبکەی کە تۆ بەڕاستی سڵاوی ڕێز دەنوێنیت بۆ خودا و قسەی لەگەڵ دەکەیت، بەم شێوەیە و لەسەر هێڵی گەرم و بەبێ سیم و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەبێ نێوەندگیری و واستە؟! خوا گەورەتر و بەڕێزترە... خوا گەورەتر و بەڕێزترە.

ئێمە لە نزای (التحیات)دا لەبەردەم چوار سڵاوی ڕێزدارانەی گەورە و جۆراوجۆرداین نەك یەك دانە. ئەوەتا لە سەرەتادا ئێمە لەبەردەم بونیاتنەری گەورەماندانین و سەلامی ڕێزدارانەی ئاڕاستە دەکەین، ئەو سڵاوە زۆر تایبەتە، ئەو چێژە ناوازەیە، کە تایبەتە بە خودای گەورە بەتەنها (التحیات لله)، پاشان ئێمە ئەوەتاین لەگەڵ پێغەمبەرە بەخشندەکەی خواداین (دروودی خودای لەسەر) سڵاوی ڕێزدارانەی لێدەکەین کە بەدوای ئەو کۆمەڵە سڵاوە بۆنخۆشانەدا دێت و

دەڵێین: (السلام عليك أيها النبي) سڵاوی شکۆمەندانەت لێ بێت ئەی پێغەمبەر، پاشان لێرەدا، لێرەدا و بەس، دەست دەکەین بە وەرگرتنی خەڵاتە گەورەکە، ئەو کاتەی کە سڵاوی سێیەم لەو چەپکە سڵاوە سەرسوڕهێنەرە لە خۆمان دەکەین (السلام علينا)، ئەمانە هەمووی پێش ئەوەی کۆتایی بەو قافڵە پیرۆزە بێنین لە سڵاوکردن، ئەویش بە ئەنجامدانی سڵاوی چوارەم لەسەر (بەندە خوداییە پیاوچاکەکان).

لە نێوان ئەم چوار سڵاوە ڕێزدارانەدا چەندین (ناوچەی سەوز) هەن، وەك پێشتر باسمانکرد، ئەمانە چەند پێکهاتەیەکی زمانەوانی زۆر گرنگن لە نوێژدا، چونکە ئەمانە چەند ناوچەیەکی زمانەوانی یەك لە دوای یەکی تەڕ و پاراومان بۆ دەستەبەر دەکات، کە بەدوای شوێنە زمانەوانییە سەرەکییە سورەکاندا دێن، بەشێوەیەك ئەم مەسافە کاتیانەی کە لە وتنەوەی ئەم شوێنە یەك لە دوای یەکە تەڕ و پاراوانەدا دەیخایەنێت ڕێگە خۆشدەکەن بۆ بەچاکیی تێگەشتنی تەواوی مانای شوێنە سەرەکیە سورەکان و ئامادەکردنی وێنا جوانەکان و ئاماژەکانیان.

ئەگەر بیهێنینە پێش چاومان، (التحيات) بەشێوەی ئیقاعێکی زمانەوانی خێرا و یەك لە دوای یەك و شێوەی بەتاڵ لە کەلێنی کاتی شوێنە زمانەوانییە زیادە سەوزەکان، تەحییات بخوێنین دەڵێین: (التحيات لله السلام على النبي، وعلينا، وعلى الصالحين)، یان خێراتر وەك: (التحيات لله ولرسوله ولنا وللصالحين).

بڕوانە ئەم دوو دەربڕینە خێرایە پێشنیازکراوە هیچ شتێکیان لە مانا سەرەکییەکە لانەبردووە، بەڵام زۆرێك لە ڕەهەندەکانی و ماناکانی و خەیاڵات (أطياف)ەکانی دەقە تەواوەکەی تەحیات لەدەست داوە.

ئەم ڕێگە پڕ کەموکورتی و پچڕاوەی ئێمە هیچ کاتێکی پێویست بۆ نوێژخوێن ناهێڵێتەوە لەدوا سەلامکردنی لە خودای گەورە: (التحيات لله) بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە هەست بە تام و چێژی ئەو ساتەوەختە نائاساییە بکات، لە گرنگی و

گەورەییەکەی ورد بێتەوە، بەشێوەیەك کە کاتی پێویستی هەبێت بۆ هەستکردن بە داڕژانی ڕەحمەت و بەرەکەتی خودایی بەشێوەیەك کە بێتە خوارێ بەسەریدا لە تەپڵەسەریەوە هەتا بنی پێی بشواتەوە، وەك وەڵامدانەوەیەکی خێرای خودایی بۆ ئەو کەسانەی کە ئەم جۆرە سڵاوەی لێدەکەن، ویستی خودایی وەهایە کە سەلامی مرۆڤەکان لێی لە نوێژەکاندا دوورودرێژ بێت، سەوز و پڕ و گەشەدار بێت، گەڕێك یان دوو گەڕ، یان زیاتر بەردەوام بێت، کۆتایی وشەکان یارمەتیت دەدەن لەسەر ئەو سوکناییە بەشێوەیەك بە دڵئاراممییەوە وشەکە زیاتر درێژ دەکەیتەوە بۆ ئەوەی کاتێکی زیاتر بەسەر بەریت لەگەڵ ئەو هەستە بەتام و چێژەی ملکەچی و خواپەرستیە

((التحيات... لله... والصلاوات... الطيبات... الزاكيات... المباركات)).

هەموو ئەمانەی باسمانکرد جێبەجێ دەبێت بەسەر ئەو سڵاوەی کە بەدوایدا دێت کە دەمانەوێت بیکەین لەسەر پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر): (السلام عليك أيها النَّبيُّ).

کاتێك سڵاو لە خۆشەویستترین کەس لەلای خودا و لە خۆشەویستترین کەس لەلای ئێمە دەکەی، هەست بە دوو چێژ دەکەیت، بۆیە هەوڵبدە کەمتەرخەم نەبی لە هیچیاندا، هەوڵ بدە کاتێکی تەواو بدە بە دەروونت کە ئەم هەلۆێستەیە جێنەهێڵێت بەبێ ئەوەی چێژ لە هەردووکیان وەربگرێت و تامیان بکات و لەشی خاو بێتەوە پێیان، ئەو دوو چێژەش:

١ـ چێژی سـەلامکردن لە پێغەمبەری خودا، وەك ئەوەی کە لەبەردەمت بێت، لەدوای ئەوەی کە هەر ئێستا چویتەدەر لە سەلامکردن لە خودا وەك ئەوەی لەبەردەمتدا بوبێت، لەگەڵ لەزەتی ئەوەی کە یەقینت هەیە کە گوێی لێتە کە سەلامی لێ دەکەیت.

٢ـ چێژی هەستکردن بە وەڵامدانەوەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر)، بەتایبەت کە تۆ دڵنیایت کە خودا ژیانی پێدەبەخشێتەوە بۆ ئەوەی وەڵامی سڵاوەکەی تۆ بداتەوە.

– "ما مِن أحَدٍ يُسلِّم عَليَ إلا ردَّ اللهُ عَلَيَ رُوحِي حَتى أرُدَّ عَليْهِ السَّلام" {رواه ابن تيمية في مجموع الفتاوى والنووي عن أبي هريرة}.

بەڵام سەیرتر و تازەتر و بەچێژتر لەمانە ئەوەیە کە بزانین خودای گەورە هاوبەشیی دەکات لەگەڵ پێغەمبەر لەم وەڵامە بەرێزەدا بەوەی کە بە چەند قات سڵاوت بۆ دەنێرێت لە پاداشتی سەلامکردنەکەت لە پێغەمبەر.

– ((أكثِروا الصَّلاةَ عَليَّ يَومَ الجُمُعَة فَإنّهُ أتاني جبْريلُ آنِفًا عَن ربِّه – عز وجل – فَقالَ ما عَلى الأرضِ مِنْ مُسلِمٍ يُصلِّي عَلَيكَ مَرَّةً واحِدَةً إلاّ صَلَّيتُ أنا وَمَلائِكَتِي عَليْهِ عَشرًا)). *{حسنه الألباني في صحيح الترغيب، عن أنس بن مالك}*.

الله.. چ سەلامێکە! چ پاداشتێکە!: دەتوانین بە خەیاڵ و ئەندێشەمان تا خەیاڵدانمان بڕ دەکات بەهای ئەوە بێنینە بەرچاومان کە خودای گەورە سەلاممان لێ بکات؟ پاشان بەهای ئەوەی ملیۆنان مەلائیکە سەلاممان لێ بکەن بە فەرمانی خودا؟ یەکجاریش نا، بەڵکو دەیان جاری یەك لەدوای یەك و بەردەوام، ئەم سەلامە پیرۆزانە دووبارە دەبنەوە هەموو جارێك کە سەلامەکانت دووبارە دەبنەوە لەسەر پێغەمبەری خودا لەکاتی تەحیاتدا و لەدەرەوەی تەحیات؟

## کلیلی سووری ژماره (٤)
## السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین
## سه‌لام له سه‌ر ئێمه و به‌نده چاکه‌کان

ئه‌م سه‌لامکردنه به‌ته‌نها سه‌لامکردن نییه، به‌ڵکو ڕه‌مزی ئه‌و خه‌ڵاته گه‌وره‌یه‌یه که پێتبه‌خشراوه له‌به‌رامبه‌ر چوونت بۆلای خودای گه‌وره. له‌کاتی سه‌ردانی کردنت بۆلای سه‌رۆك یان پاشا ده‌بینیت له‌کاتی خواحافیزی له‌لای ده‌رگاکه‌دا خه‌ڵاتێکی سه‌رۆکانه یان پاشایانه‌ی شایسته‌ت بۆ دانراوه که عاده‌ت وایه ده‌درێت به‌و که‌سانه‌ی که دێنه سه‌ردانی پاشا و سه‌رۆکه‌کان. له‌به‌رئه‌وه‌ی پاشایانه یان سه‌رۆکانه‌یه دیارییه‌کی ئاسایی نییه، به‌ڵکو دیارییه‌کی شایسته‌یه به پێگه‌ی پاشا یان سه‌رۆك.

باشه ده‌بێت به‌دیهێنه‌ری ته‌واوی پاشا و سه‌رۆکه‌کان و به‌دیهێنه‌ری زه‌وی و ئاسمان دیارییه‌که‌ی چی بێت کاتێك یه‌کێك ده‌چێت بۆ سه‌لامکردن لێی؟ به‌ڕاستی پێویسته گه‌وره‌تر و به‌قه‌درتر بێت له‌وه‌ی چاوه‌ڕون ده‌کرێت.. ئه‌و دیارییه ملیاران ملیاره له خه‌ڵات، ئه‌م خه‌ڵاتانه‌ت پێ ده‌گات به قه‌ده‌ر ژماره‌ی دروستکراوه‌کانی خودا له به‌نده چاکه‌کان له ئاسمان و زه‌وی له‌و ڕۆژه‌وه که ئاده‌م دروست کراوه هه‌تا ڕۆژی زیندوبوونه‌وه، ئه‌مه ئه‌گه‌ر بڵێین یه‌ك چاکه یان چه‌ند چاکه‌یه‌ك بۆ مرۆڤ هه‌یه له بری هه‌ر سه‌لامێك که ده‌یکات له یه‌کێك له به‌نده‌کانی خودا، وه‌ك پێغه‌مبه‌ری خودا به‌ڵێنی پێداوین:

- ((مَنْ قالَ: السَّلامُ عَليكُم كُتبَتْ لَهُ عَشْرُ حَسناتٍ ومَنْ قالَ: السَّلامُ عَلَيكُم ورَحمةُ اللهِ، كُتِبَتْ لَهُ عُشرونَ حَسنةً، وَمَن قالَ: السَّلامُ عَليكُمْ ورَحْمةُ اللهِ وبَركاتُهُ، كُتِبَتْ لَهُ ثَلاثُونَ حَسنَة)). *{صححه الألبانی في صحيح الترغيب، عن سهيل بن ضيف}*.

کاتێك تۆ ئەم سلاوە چەندقاتە لە نوێژەکەتدا دووبارە دەکەیتەوە پێویستە بزانیت کە لەو کاتەدا پاداشتی چەندقات دەڕژێ بەسەرتدا، بەم شێوەیە:

١- پاداشتی ڕێزدارانەی ئامادەیی سلاوی خودایی بێکۆتا، هەستپێکردنی ڕژانی بەسەرتدا و بەسەر کەسوکارتدا و بەسەر خۆشەویستاندا (السلام علینا)، بۆیە دەتشواتەوە و دەیانشواتەوە بە سلاوی خوایی و سۆز و میهرەبانی و دڵدامەزران و سەلامەتی.

٢- پاداشتی ڕێزدارانەی ئامادەیی ئەم هەموو چاکە بێکۆتاییە و هەستکردن بەو ساتەوەختەی کە دەڕژێت بەسەرتدا بەخێرایی و داتدەپۆشێت بەئارامی و ئەمینی لە تەپڵی سەرتەوە هەتا بنە پێت، لە پاداشتی سەلامکردنت لەم هەموو ژمارە زۆرە بێ کۆتاییەی مسوڵمانان لە (بەندە چاکەکان- عباد الله الصالحین).

جارێکی تر دەبێ ئەوە بیربێنینەوە کە سلاوکردن تەنها لەسەر خۆت نەبووە، ئەم سلاوە لەگەڵ راناوی (علینا)دا هاتووە، جیاوازییەکی زۆریش هەیە لە نێوان ئەوەی کە سلاو لەخۆت بکەیت بەتەنها و سلاو لەهەموو ئەوانە بکەیت کە لە چواردەورتن لە خۆشەویستانت و لە خزمە نزیك و دورەکانت و هەموو مسوڵمانان، پاشان لەسەر ئەو وەچەو رەچەڵەکە زۆرانەی کە ناژمێردرێن لە بەندە چاکەکانی خودا لەسەر زەوی و لە ئاسمان و لە نێوانیاندا، لە بری هەر یەکێکیشیان خەلاتێکت بدرێت.

لە کۆتایشدا (تەحیات)ەکەت بخوێنە و صلاواتدانی ئیبراهیمی بخوێنە بەشێوەیەك کە وەرگر و بەخشندە بیت، چونکە تۆ لە نوێژەکانتدا بەس نابەخشیت بەڵکو وەریش دەگریت، بەڵکو دەبێ دڵنیابیت کە تۆ لە بری هەر وشەیەك کە دەیڵێیت ڕاستەوخۆ لەدوای وتنی خێرەکەیت بۆ دەنووسرێت و پاداشتەکەی وەردەگریت. بۆیە ئەو ڕستانە بخوێنە کە باسی بەخشینی تێدایە و هەڵوێستەیەك

بکە بۆ ئەوەی پاداشتی ئەو ڕستە و بەخشینە وەربگریت، بۆیە بەم شێوەیە ڕستەکان بخوێنەوە، بەم شێوەیە پاداشتەکانی وەربگرە.

ئێستا لەدوای ئەو هەموو شتانەی باسمان کردن لەبارەی نوێژەوە، هەر وا دەزانی کاتێك هەڵدەستی بۆ نوێژکردن کە تۆ بەرەو جێبەجێکردی ئەرکێك دەڕۆیت و لەسەر شانی لادەبەیت؟ یان بەشێوەیەك هەنگاو دەنێیت بۆ ئەنجامدانیان کە خەڵاتێکی زۆر گەورە وەردەگریت کە گەورەترە لە هەموو خەڵاتە دونیاییەکان و مافێکە لە هەموو مافەکان گەورەتر؟ بۆیە ئەگەر دەرنەچیت لە نوێژەکەت بەشێوەیەك کە وا هەست بکەیت کە تازە لەدایکبوویتەوە، ئەوە بزانە خێرێکی زۆرت لەدەستداوە.

## لەگەڵ دانیشتنێك بۆ دوعا و وێردەکان

دوعاکردن جۆرێکی سادەیە لە جۆرەکانی نوێژ خوێندن، ڕۆحی نوێژی تێدایە، بەڵام چوارچێوە فەرمییەکان و یاسا و ڕێسا و ئامادەسازی و هەڵسوکەوت و کاتە دیاریکراوەکانی ئەوی نیە، چونکە دوعا جۆرێکە لە نوێژ خوێندنی ئازاد و ئاسان لەڕووی هەڵگرتن و گواستنەوەوە (وەك مۆبایل) کە لە پڕ لە هەرکاتێکدا بێت و لە هەر شوێنێك بێت هیچ ئیحراجییەك نابینی لە جێبەجێکردنی هەر کاتێك بانگت بکات، لەهەر هەڵوێستێك خۆتی تێدا ببینیتەوە.

لێرەدا دەمەوێ سوود لە دیاردەیەکی زمانەوانی وەربگرم لەلای ئینگلیز، دەبینین جیاوازی ناکەن لەنێوان دوعا و نوێژ بۆ هەردووکیان وشەی (pray) بەکاردەهێنن، لەم تێکەڵکردن و ئاوێتەکردنەدا ئاماژەیەکی زمانەوانی زیرەکانە هەیە، ئەویش ئەوەیە مادام گوتارەکە لە داڕشتن و پێکهاتەکەیدا ڕووکردنە خودای گەورەیە ئەوە بەشێکە لە بەشەکانی نوێژ ڕەنگە پەیوەستبوونی ئەم دوو وشەیە ئەوەشمان بۆ ڕاڤە بکات کە زمانی ئەو دوعا و پاڕانەوانەی کە سابت بوون لە

پێغەمبەرەوە کە ڕوی پێکردوونەتە خودای گەورە زۆر جیاواز بێت لە زمانی ئەو فەرموودانەی کە ڕوی پیّ کردونەتە خەڵك.

زمانی دوعاکانی پێغەمبەر تایبەتمەندی خۆی هەیە پێی جیادەکرێتەوە لە ڕووی ڕەوانبێژی و جوانیی و ئیقاع و سۆزداری و کارگەرییەوە کە ئەو کەسانەی تام و چێژ لەم بابەتانە وەردەگرن ورددەبنەوە و هەستی پێدەکەن و ئەوانەی کار لە سەر ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی دەکەن لە ڕووی پڕاکتیکیەوە شێوازەکانی زمانی عەرەبی و نهێنییە رەوانبێژییەکان درك پێدەکەن. ئەم جۆرە زمانەی دوعاکان کە بەم شێوەیە تابەتمەندی جیاوازی هەیە لەگەڵ زمانی فەرمودەکانی تر کە بەشێوەیەکی سادە وتراوە، لەگەڵ جەختکردنەوەمان لەسەر جوانیی زمانی فەرموودەکان و باڵاییان لەسەر شێوازی هەموو کتێب و نوسراوێکی عەرەبی تر، لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە هەموو ڕەخنەگرێی ڕا پەسەند دەتوانێت جیاوازیی بکات لەنێوان زمانی فەرموودەی قودسی و زمانی فەرموودە ئاساییەکانی تر.

بەڕاستی لە زمانی دوعاکان و نەرمی ئیقاکەیاندا هەست بە دستێکی ڕۆحانی دەکەین، وەك ئەوەی ئاسمان هاوکاری کردبێت لە داڕشتنیان وەك فەرموودە قودسیەکان بەم شێوەیەن. پێغەمبەری خودا زۆر جەختی کردۆتەوە لە هاوەڵانی لەسەر وتنەوەی دوعاکان وشە بە وشە لەدوایەوە و فێرکردنیان، ئاگاداری کردوونەتەوە لەسەر پارێزگاری کردن لەسەر وشەکانیان و داڕشتنەکەیان بەبیّ دەستکاری و گۆڕانکاری. گوێبگرە چۆن ئەوکەسە ڕاستدەکاتەوە کە لە جێی وشەی (الرسول) (النبي) داناوە لەگەڵ ئەوی کە هەردوکیان ئاماژەن بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر):

– عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ، فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ، ثُمَّ قُلْ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ

مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ، فَأَنْتَ عَلَى الفِطْرَةِ، وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَتَكَلَّمُ بِهِ)). قَالَ: فَرَدَّدْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا بَلَغْتُ: اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، قُلْتُ: وَرَسُولِكَ، قَالَ: ((لاَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ)) *{رواه الشيخان}*.

واته: (له بەرائی كوری عازیبەوە فەرمویەتی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) فەرمووی: (ئەگەر ویستت بێیتە سەرجێگای خەوتنت دەستنوێژێك هەڵبگرە وەك ئەو دەستنوێژەی كە بۆ نوێژەكانت هەڵیدەگریت، پاشان لەسەر لای راست رابكشێ و بڵێ: خودایە رووی خۆمم تەسلیم بەتۆ كرد و كاروباری خۆمم تەسلیم بەتۆ كرد و پشتم بەتۆ بەست، لەبەر حەز و ترسی خۆم لەتۆ، پەنا و نەجاتبونی تر نییە لەتۆ تەنها بۆ لای تۆ نەبێت خودایە باوەڕم هێنا بە كتێبەكەی تۆ كە ناردوتەتە خوارەوە و بە پێغەبەرەكەت كە رەوانەت كردووە. ئەگەر ئەو شەوە مردیت ئەوە لەسەر فیترەت مردوویت و هەوڵ بدە كە ئەمانە كۆتا قسەكانت بێت). بەرائی كوری عازب دەڵی: بۆ پێغەمبەرم خوێندەوە بزانم لەبەرمە، كاتێك كە گەیشتمە ئەو دەربڕینەی (وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ) لەجیاتی (ونبيّك) وتم (ورسولك) وتی: "نا بەراستی بیخوێنەرەوە بڵی (وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ)" نەك (ورسولك).

## پەسمەندە – الرصيد

دەبێ هیچ یەكێك لە ئێمە كاتێك كە لە نوێژەكەی تەواو بوو هەوڵی دابێت قەڵەم بە دەستەوە بگرێت و دەستبكات بە هەندێك ژماردن و ژمارەی ئەو چركەساتانە تۆمار بكات كە هەستی بەوە كردووە كە بەڕاستی ئاخاوتنی كردووە لەگەڵ خودادا، لە نوێژەكەیدا هەستیكردوە كە جۆرە پەیوەندییەك دروستبووە، دڵ خورپەیكردوە و لەش لەرزیوە ئەگەر بۆ یەك جاریش بێت، ئەگەر چركەیەكیشی

خاياندبێت یان بەشێك لە چرکەیەك، بەشێوەیەك لە کۆتایدا بتوانێت ئەم چرکەساتانە ئەژمار بکات، پاشان ڕێژەکە دیاری بکات ئەگەر بەشێوەیەکی ڕێژەیی مرۆڤانەش نەبێت، ئەوەندەی دەستی کەوتوە لە پەسمەندە لەو نوێژەیدا ببژێرێن بەپێی ئەو خشتەیەی کە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر) پێشکەشی کردوین:

– عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: ((إِنَّ الرَّجُلَ لَيَنْصَرِفُ وَمَا كُتِبَ لَهُ إِلَّا عُشْرُ صَلَاتِهِ تُسْعُهَا ثُمْنُهَا سُبْعُهَا سُدُسُهَا خُمْسُهَا رُبْعُهَا ثُلُثُهَا نِصْفُهَا)) *{رواه أبو داود والنسائي و صححه الألباني عن عمار بن ياسر}* .

واتە: (لە عەمماری کوڕی یاسرەوە دەفەرمێ: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (دروودی خودای لەسەر) دەیفەرموو: (پیاو لەنوێژ دەبێتەوە کەچی جاری وا هەیە تەنها دەیەکی نوێژەکەی بۆ نوسراوە، یان نۆیەکی یان هەشتیەکی یان حەوتیەکی یان شەشیەکی یان پێنجیەکی یان چواریەکی یان سێیەکی یان نیوەی).

هەوڵبدە لە نوێژەکەت دەرنەچیت بەبێ هەستکردن یان دەرکەوتنی یەکێك یان زیاتر لەو ڕێژانە تیایدا، ئەگەر لە ڕکاتی یەکەمدا لەکیست چوو هەوڵبدە لە ڕکاتی دووەم ئەگەرنا سێیەم ئەگەر هەر نەتتوانی چوارەم، ئەگەر لە سوننەتەکان سەرکەوتوو نەبووی هەوڵبدە لە فەرزەکاندا، ئەگەر لە نوێژی بەیانی نەکرا هەوڵبدە لە نوێژی نیوەڕۆدا ئەگەرنا عەسر ئەگەرنا مەغریب ئەگەر نا نوێژی عیشا، بەشێوەیەك ڕۆژێك تێنەپەڕێت بێ ئەوەی بگریت لە یەکێك لە نوێژەکانتدا فەرز یان سوننەت بەلایەنی کەمەوە، یان ڕابچڵەکیت و بلەرزیت یان دڵت خورپەبکات لە هەندێکاندا، یان هەستبکەیت بە لەزەتی پەیوەندیبەستن لەگەڵ خودای گەورەدا. ئەمە کەمترین ڕێژەی ئیمانە، ئەگەر زیاترت کرد ئەوە زۆر باشە، چەندیش باشە وابکەیت دەستکەوتی زۆر کۆبکەیتەوە و قازانجی زۆر بەدەست بهێنیت کە لە دنیادا بەدیبهێنیت و بیخەیتە پەسمەندەی قیامەتی خۆتەوە. زۆرجار مارکێت و کۆگا

گەورەکان بانگەشە بۆ خەلأتی بەنرخ دەکەن بۆ کڕینی کالأکانیان، بۆ بەدەست هێنانی ئەو خەلأتە فۆڕمێك پڕبکەنەوە پێش چوونەدەریان، ناو و ژمارەی تەلەفون و ناونیشانی کڕیارەکانیانی تێدا تۆماردەکەن بۆ ئەوەی کە خەلأتەکەیان بۆ دەرچوو ئاگادار بکرێنەوە. تۆش لە نوێژدا لە مارکێت و کۆگای ئیلاهیدای (خوای گەورە شایستەی نمونەی بەرزتر و بالأترە– ولله المثل الأعلى)، تیایدا چەندین فۆرمی خەلأتی گرانبەها پڕدەکەیتەوە کە هەر یەکەیان خەلأتێکی تایبەتی تێدایە. جیاوازیشیان لەگەڵ خەلأتی کۆگاکان ئەوەیە کە لە کۆگای خوایدا تۆ لە کۆتایدا تەنها یەك خەلأتت بە نسیب نابێت بەڵکو هەموو خەلأتەکانت بۆ زامن کراوە لە سەدا سەد، بەلأم بەو مەرجەی کە فۆرمەکانت بەشێوەیەکی دروست پڕکردبێتەوە بێ کەم و زۆر.

بەنوێژکردن تۆ بەرەو ڕوی گەورەترین پڕۆژە وەبەرهێنانەکان دەچیت لە ڕوی قازانج و پاراستنی قازانجەکان بەڕەهایی، لەگەڵ کەمترین خەرجی. ئەم پڕۆژە بازرگانییە گەورەیە کەمترین دەستمایەی دەوێت کە نزیك دەبێتەوە لە سفر. تۆ لە زەکاتدا پێویستیت بە دەفع کردنی ٢.٥٪ ی پارەکەت هەیە بەلایەنی کەمەوە، لە حەجدا پێویستیت بە بودجەیەکی قەبە هەیە کە گاڵتەی پێ ناکرێ بۆ سەفەر و مانەوە و شتی تر، لە ڕۆژوودا پێویستە دەم بگریتەوە لە خواردن و خواردنەوە و زۆرێك لە شتە حەلألەکانی تر، بێجگە لە دانی سەرفترە لە کۆتاییدا. بەلأم نوێژ کەمترین تێچووی هەیە تێچووەکەی زیاتر نییە لەو ئاوەی کە بەکاری دەبەیت لە دەستنوێژدا و ئەو کاتە کەمەی کە بەسەری دەبەیت لە نوێژکردندا. ئەمە هەموویەتی نە رسوماتی زیادە و نە باج.. لەبەرامبەریشدا: چەندین قازانجی قەبە کە ڕاستەوخۆ دەچێتە سەرحسابەکەت، تەنانەت هەندێکی بە دەستی وەردەگری پێش چوونەدەرت لە نوێژ: ئاوەدانی دڵ، لەشساخی و ئارامی و زهن سافی و هەستکردن بەوەی کە تازە لەدایکبوویت، ئەم قازانجانە لە دوای نوێژ هەست

پێدەکەیت، لەکاتێکدا بەشێك لە قازانجەکەت دەپێچرێتەوە لە چەند سندووقێکی جواندا دەنێردرێت بۆ ناونیشانەکەت، جا یان لە دنیادا بەوەی: بەرەکەت و سەلامەتیی و پشتیوانیی و قبوڵبوونی دوعا جیا جاکانت بۆ دەستەبەر دەبن، یان دەنێردرێت بۆ ناونیشانی دوارۆژت: بەوەی هەرچی گوناهی ڕابردوو دەسڕێنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بڕێکی لە ژمارە نەهاتوو لە چاکە دەخرێتە سەر پەسمەندەکەت لەوێدا.

باشە پڕۆژەیەکی بەم شێوەیە شایستەی ئەوە نییە کە دەفتەرێکی ژمێریاری بۆ دابنێین بۆ تۆمارکردنی قازانج و زەرەر؟ زەرەریش لێرەدا مەبەست لەو زەرەرانە نییە کە ئێمە دەیزانین، چونکە مەبەست کەمکردنی سەرمایەکە نییە، بەڵکو مەبەست کەمکردنی ڕێژەی قازانجە کە دەکرا بەدەستی بهێنین و بیدەینە پاڵ سەرمایەکانمان، بەدڵنیاییەوە سەرمایەکانمان لە خراپترین حاڵەتدا سەلامەت و تەواو دەبێت لە نوێژەکانماندا و دەستی کەمکردن و زەرەریان پێناگات مەگەر خوانەخواستە نوێژەکانمان بە دووڕوویی و هەڵخەلاتاندن و ڕوپامایی بکەین.

بناغە لەسەر ئەم تێگەشتنە وەبەرهێنانە تازەیە بۆ حسێبکردنی قازانج و زەرەر، ئایا دەتوانن هەندێك گریمانەی ماقول بکەن بۆ ئەو قازانجانەی کە توانیوتانە بەدەستی بهێنن لە کۆتایی هەر نوێژێکدا؟ هەروەها تەقدیرکردنی ئەو قازانجانەی کە لە دەستتان چوون لە جەنجاڵیی و قەرەباڵخیی و سەرقاڵیی زهنتاندا کە ڕەنگە زاڵبووبێت بەسەرتاندا و توند گرتبنی دوور لە نوێژەکانتان بۆ چەند ساتێك؟

## خشتەی ئەوەی دەستتکەوتون لە گەوهەرەکانی نوێژ

لەبیر نەکەیت لەسەرەتادا، کاتێك دەست دەکەیت بە چاوپیاخشاندنەوەی کاری ژمێریاریی نوێژەکانت کە بگەڕێیەوە بۆ ئەو هێڵانەی کە دیاریمان کردن بۆ نوێژ، بۆئەوەی بزانی چەند پەیوەست بوویت بە هەریەك لەو هێڵانەوە کە لە هێڵی زەمەن، هێڵی زمان، هێڵی جەستە، هێڵی دڵ، هێڵی کردەوەکان لە بیر نەکەیت لە کاتی ئەم چاو پیاخشاندنەدا ڕەچاوی ئەو ساتانە بکەیت کە لە نوێژدا سەرفت کردوون، بۆیە ئەگەر لە دوو ڕکات بوویتەوە لە دوو یان سێ خولەکدا ئەوە بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە نوێژەکانت تەنها بەشی ئەو حەرفانەی کردووە کە خوێندووتن و هەناسەی نەبووە لە نێوانیاندا تا لە مانای ئەو وشانە تێبگەیت، هەناسەت نەداوە بۆ وەرگرتن و تێگەشتنی تەواو بۆ بەرجەستەکردنی جوڵەی چوار هێڵەکەی تر.

پێویستە هەموو موسوڵمانێك کێشانەیەك بۆ خۆی دابنێت کە بەشێوەیەکی ڕێژەیی ئەو نمرانەی پێ دیاری بکات کە دەکرێ بەدەستی هێنابن لەدوای هەر نوێژێك، ئەو هەر بۆ خۆی دەزانێت نوێژەکەی چۆن بووە، هەر لەبەر ئەوە پێشنیاری ئەم کێشە مرۆڤانە سەرەتاییە دەکەم کە ئامۆژگاری خۆم و ئێوە دەکەم کە پشتی پێببەستن و ژماردنەکانتان و پێوانەکانتانی لەسەر بنیات بنێن بۆ کۆکردنەوەی بەرهەمی هەر نوێژێك لە دوای تەواوکردنی، ئەگەرچی ڕێژەی بەرهەمی کۆتایی نوێژەکانمان کەس بەتەواوی نایزانێت و بەدروستی نایکێشێت بە کێشانەی ڕاست و دروست تەنها زانا و شارەزا و کارامەکە بەم نوێژە ڕێنماییمان دەکات بۆ لای خۆی:

١- ئایا هەستم کردووە لەکاتێکدا دەستەکانم بەرز دەکەمەوە بۆ (الله أکبر)ی چوونە ناو نوێژەوە کە وازم لە هەموو شتێك هێنا لەدوای خۆم و چوومە ناو جیهانێکی بەرزتر کە پەیوەندی بە جیهانی زەوییەوە نییە؟

٢- چەندجار (الله أكبر) توانیویەتی کە لاشەم ڕزگار بکات لە پەرت و بڵاوی و بێئاگاییم لە نوێژدا، بابەتێك لە زهنم دەربکات کە خەریکە بێ ئاگام دەکات لە جیهانە نوێیەکەم کە تازە چومەتە ناویەوە، بەهۆیەوە بەرز بوومەتەوە زۆر بەرز و دوور لە شتە بێهودەکانی دنیا و مەشغوڵکەرەکانی، چونکە من ئێستا لەگەڵ (الله أكبر — لەهەموو شت گەورەتر)دام.

٣- چەندجار وشەی (الرحمن) توانیویەتی بمشواتەوە بە نوری خۆی بەشێوەیەکی ئاسۆیی (لە ئاسمانەوە بە تازەیی باریوە بەسەرمدا)؟ چەندجار وشەی (الرحيم) توانیویەتی بەستوونی بمشواتەوە (واتە بەشێوەی ڕەحمەتێکی بێکۆتایی لەسەرەتای دنیاوە هەتاهەتایە) بەشێوەیەك ئەم پاککردنەوەیە هەموو لاشە و ڕۆحم بەیەکەوە بگرێتەوە؟

٤- چەند دەربڕینی قورئانیم خوێندۆتەوە لە فاتیحەدا لە شێوەی (الحمد لله — رب العالمين — مالك يوم الدين — إياك نعبد) هەستم بە ماناکانی کردووە لە ناخمدا، لە ناخمدا هەستم بەگەورەیی خودا کردووە کە لەبەردەممدایە، و هەستم بەگۆڕانی شتێك دەکرد لە ناخمدا لەکاتی خوێندنەوەیان؟

٥- چەند دەربڕینی قورئانیی یان ئایەتی قورئانیم خوێند لە فاتیحە و ئەوانەی دوای فاتیحە لە ئایەتە قورئانییەکان، کاتی پێویستی سەوزم پێدا بۆ ئەوەی دەستیان پێوە بگرم و لەدەستیان نەدەم و بیر لە ماناکەی بکەمەوە و وردببمەوە لێی؟

٦- لەکاتی خوێندنی (اهدنا الصراط المستقيم) ئایا خێزان و خزم و هاوڕێ موسوڵمان و نا موسوڵمانەکان، دوژمنەکانم موسوڵمان و ناموسوڵمانەکانم لەبیر بووە بۆئەوەی ئەم دوعا پیرۆزە بیانگرێتەوە بۆ ئەوەی هیدایەتیان بدات؟ ئایا هەستم بە چێژی خەڵاتی ڕاستەوخۆ کردۆتەوە کە دەبارێت بەسەرمدا لە پاداشتی

پاکی دڵ و دەروونم لە بەرامبەریان  و داوای بارینی هیدایەت بەسەریاندا لە خودای گەورە یان ڕێنموییان بۆ ڕێگای ڕاست؟

٧- چەندجار هەوڵمداوە لە دەروونمدا ئەو بۆشاییە سەوزە ئیفترازیەی دوای (الله أكبر) و دوای هەر زیکرێك لە زیکرەکانی ڕکوع و سوجدە پڕ بکەمەوە؟ چەند چرکەی سەوز مافم بە نەفسی خۆم داوە  لەدوای هەر (الله أكبر)ێك و هەر (سبحان الله)یەك  بۆ پڕکردنەوەی  بە بیرۆکەیەکی ئیفترازی گونجاو؟

٨- چەند دوگمەی سوور لەم پلاکانەی خوارەوە دەستم پێداناوە لەکاتی نوێژەکەمدا و هەستم کردووە کە وزەکەی گەشتۆتە قوڵایی ناخمەوە و ڕایوەشاندوم و دڵم کەوتۆتە لەرزە بۆی و  گریاندومی:

- دوگمەی (إياك نستعين)؟ چەند چرکە کاتم بە خۆم داوە لەدوای ئەم دەربڕینە بۆ ئەوەی جۆری ئەو یارمەتیە ئامادە بکەم کە داوای دەکەم، بۆئەوەی بیهێنمە بەرچاوم شێوەی خۆم و شێوەی ئەو خەڵکانەی کە ئەم داواکارییە دایاندەپۆشێت بەو سیفەتە گشتگیرەی (نستعين)؟

- دوگمەی  (التحيات لله)؟ ئەو کاتە چەند بوو کە ئەم درێژکردنەوەیە خایاندی و هەروەها ئەو ڕاوەستانەی دوای خوێندنی ئەم دوو وشەیە، پاشان بەشی دووەمی دەربڕینەکە (والصلوات) و بەشی سێیەمی (والطيبات)...؟ ئەو کاتەی کە من هەوڵمدا کاتێك بە خۆم بدەم و ئەم دیمەنە جوانە بەسەر ڕۆحمدا بێنم: دیمەنی چوونە بارەگای خودا، پاشان سەلامکردن لێی بەو سیفەتەی کە خۆی فێری کردووم، هەستکردن بەخۆشیی سەلامکردن لێی، پاشان هەستکردن بەچێژی وەڵامی خودایی بۆ ئەو سەلامە؟

- دوگمەی (السلام عليك أيها النبي و رحمة الله و بركاته)؟ ئەو کاتە چەند بوو کە خوێندنەوەی ئەم سڵاوە ڕێزدارانەیە خایاندی؟ بەتایبەت ئەو وشانەی کە (مد)یان تێدایە (السلام، الله، بركاته) بەشێوەیەك کە توانیبێتت بەیارمەتی ئەو

بۆشاییە کاتیانەی کە لە (مد — درێژکردنەوە)کاندا هەیە لەگەڵ ئەو بۆشاییە کاتیە سەوزانەی لەدوای ئەم سڵاوە وەك ئەو سڵاوەی کە بەدوایدا دێت، هێنانە بیری چێژی سەلامکردن لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر) یەکەمجار و هەست کردنی چێژی وەڵامدانەوەی ڕاستەوخۆ دووەم جار؟

– دوگمەی (السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین)؟ هەستم کردووە لەکاتێکدا کە ئەم سەلامە ڕێزدارانە لە خۆم دەکەم و لەوانە دەکەم کە گرنگن بەلامەوە لە مرۆڤەکانی چواردەورم پاشان لە چەندین نەوە لە بەندە چاکەکان لە زەوی و لە ئاسمان لە هەر کوێیەك بن، لە هەر زەمەنێکدا ژیابن کە چەندین پرژە سڵاوی پیرۆز و پاك دەڕژێت بەسەر من و ئەواندا قوڵایی دەروونی من و ئەوان پاکدەکاتەوە لە هەموو ئەو شتانەی ئازاری من و ئەوانیش دەدات، ئەم جۆرە پرژەی یەکەم لە سڵاو، پاشان پرژەیەکی پاکی تر ڕاستەوخۆ دامدەپۆشێت لەو کاتەی کە ئەو خەڵاتە ڕێزدارانە وەردەگرم لە ئاسمانەوە بەسەر هەر سڵاوێك کە دەیکەم لە سەراپای سەرمەوە تا بنە پێم  بۆئەوەی هەموو سەرئێشە یان نەخۆشی یان ماندووبوون یان خەفەت یان دڵەڕاوکێ لابەرێت دووەمجار؟

٩– ئایا توانیومە ئەو ڕکاتە سوننەتانەی کە ئەنجامیان دەدەم ئەو خاڵە فەوتاوانەی لەڕکاتی نوێژە فەرزەکاندا لەدەستم چوون لەو شتانەی کە باسمانکردن پڕ بکەینەوە یان بەپێچەوانەوە؟

١٠– لە کۆتاییدا ئایا سەرکەوتوو بووم لەم ڕاهێنانە تازەیەدا، لە ڕاهێنانەکانی (صبر ـ ئارامگرتن)؟

هەستم کردووە کە وزەیەکی تازەم لە وزەی ئارامگرتن بۆ زیادبووە؟ هەستم نەکردووە کە شتێك لە دەرونمدا گۆڕاوە؟ ڕۆح و ڕەوشت و نەرم و نیانی و دانایی ئەگەر ئەم گۆڕنکارییە کەمیش بووبێت.

## خشتەی ئەو گەوهەرانەی لەدەستت داون لە گەوهەرەکانی نوێژ

١- چەند (الله أكبر)م لەدەستچووە بەبێ ئەوەی بتوانم بەهۆیەوە زاڵ ببم بەسەر هەموو ئەو شتانەی لە نوێژەکەم دوورم دەخاتەوە و بێئاگام دەکات لێی.

٢- چەند ئایەتم خوێندوە بەبێ بیرکردنەوە تێپەڕیوم بەسەریدا، ماناکەییم ئامادە نەکردوە لە دەروونمدا.

٣- چەند تەسبیحات لە ڕکوع و سوجدەکاندا یان چەند دەربڕین و سڵاو وتومنەتەوە لە نوێژەکەمدا وەك بەبەغا و شیرینییەکانم نەچەشتوە و مانا بۆن خۆشەکانم بۆن نەکردوە و کاتە بەتاڵە ئیفترازییە سەوزەکانیم سوود لێ وەرنەگرتوە؟

٤- چەندجار ڕێگەم بە خۆم داوە جلەکانم کۆبکەمەوە لەکاتی دابەزینم بۆ سوجدە بردن، چەندجار دەستم یا ئەندامەکانی تری لەشم جووڵاندووە، جووڵاندنێك کە دەمتوانی نەیکەم بەبێ ئەوەی کاریگەریی دروستبکات لەسەر خشوع و ملکەچیم؟

٥- چەندجار هێڵ و وێنە و ڕەنگەکان و ئەو شتانەی کە لەبەردەممدا بوون لەسەر بەرماڵی نوێژ یان لەچواردەورم بێئاگایان کردووم لەکاتی نوێژکردندا؟

٦- چەندجار کارێکی دنیایی زاڵبووە بەسەرمدا و دووری خستومەتەوە لەوەی کە لەنوێژدا خوێندومە؟

٧- چەندجار بەتوندی بێئاگای کردووم لە نوێژەکەم قسەکردنێکی لاوەکی لەلایەن ئەوانەی لەگەڵمدان لە مزگەوت یان لە شوێنی تر یان دەنگی تەلەفزیۆن یان ڕادیۆ یان جەرەسی تەلەفۆن یان لەدەرگادان؟

٨- کام هێڵی شەمەندەفەری پێنج نوێژەکە شەمەندەفەرەکەیم لەکیس چووە لە نوێژەکەمدا و لە هێڵەکانی تردا: کات، زمان، لاشە، دڵ و کار ئامادەیی نەبووە؟

٩- لەدوای نوێژەکان: ئایا بەرگرییەکی زیاترم دەستکەوتووە کە هەستبکەم دەمپارێزێت لەو کارانەی پێچەوانەن لەگەڵ ئەوانەی بە چپە لەگەڵ خودادا وتوومن لە نوێژەکەمدا .

١٠-لەدوای نوێژ: ئایا لە خولی عەزیمەت و سەنگینی و ئارامگرتن دەرچوم؟ ئایا چۆن چویتە نوێژەوە ئاوا بەجێت هێشتوە؟

لەکۆتاییدا لە کۆتایی ڕۆژەکەتدا، کاتێك کە سەر دادەنێیت لەسەر سەرین، دوعاکانی خەوتن دەخوێنیت کە لە پێغەمبەرەوە پشتڕاست و سابت بوون، لەو کاتەدا لەبیرت نەچێت هەوڵبدە کردارێکی حسابی خێرا ئەنجام بدەیت کە خولەکێك زیاتر لە کاتت ناگرێ، هەموو ئەو خاڵانەی کە تۆمارت کردوون بۆ خۆت لە نوێژەکانی ئەو ڕۆژە، بەتایبەت ئەوانەی پەیوەندیان هەیە بە کلیلە سوورەکانەوە، ئەمانە بەراورد بکەی بە ئەوانەی کە تۆمارت کردوون لە ڕۆژی پێشوودا بۆئەوەی بزانی ئایا پەسمەندەکەت زیادبووە و بەرەو پێش چووە یان بەرەو دوا بۆئەوەی بۆ ڕۆژی داهاتوو ئەو کەمتەرخەمییە پڕ بکەیتەوە بۆئەوەی هێڵی ڕوونکردنەوە (الخط البياني)ی خاڵەکانت لەبەرەوپێشچوونی بەردەوامدا بن هەوڵبدە لە کۆتایی هەفتەدا نمرەی کۆتایی هەفتە هەمووی تۆمار بکەیت بۆ خۆت پاشان نمرەی ئەم هەفتەیە و هەفتەی پێشوو بەراورد بکە بۆئەوەی دڵنیا بیت لە پێشکەوتنی بەردەوامدایت لە قازانج و وەبەرهێناندا.

# با ژیانت هەمووی نوێژ بێت

ماوەیەك بەبەردەوامی ئەو فەرموودەیەم بە ئەقڵم ئەمدیواودیو دەکرد کە باسی هاتنەخوارەوەی فەرمانی نوێژ دەکات بۆمان کاتێك میعراج کرا بە پێغەمبەری خودا بۆ ئاسمان لەوێ فەرمانە خوداییە باڵاکانی وەرگرت بە تەشریعبوونی نوێژ. لەسەرەتادا وەك پێغەمبەری خودا بۆمان باسدەکات فەرمانە خوداییەکە فەرزکردنی پەنجا نوێژ بوو، پاشان بەبەردەوامی پێغەمبەر داوای لە خودای گەورە دەکرد کە سوکی بکات لەسەر ئوممەتەکەی هەتا خودای گەورە بۆی کردن بە پێنج نوێژ. هەرکاتێك ئەم فەرموودەیە بە مێشکمدا هاتبێت بەبەردەوامی دەمپرسی، ڕەنگە ئێوەش ئەو پرسیارەتان لا دروست بووبێت، باشە ئەگەر پەنجا نوێژ فەرز بوایە لەسەرمان دەبوو چۆن بووینایە؟ ئایا کاتەکانمان بەشی شتی تری دەکرد بێجگە لە نوێژ؟ کەی بخۆین و کەی بخۆینەوە و بخەوین و کەی هەڵبستین و کەی بخوێنینەوە و بنوسین و قسەبکەین و فێربین و کاربکەین و بینابکەین و زەوی ئاوەدانبکەینەوە و چێژ لە ژیان وەرگرین و هەر یەکێکمان سەردانی کەسوکار و هاوڕێکانی بکات و... هتد؟

بەڵام کاتێك هەستم بەڕاستیی و نهێنییەکانی نوێژ و سروشتی و ڕۆڵە کاریگەرەکەی لەگەڵ دەرون و لەگەڵ ژیاندا، ئەو کاریگەرییەی لەسەر نوێژخوێن بەجێی دەهێڵێت کاتێك لە نوێژ تەواو دەبێت، بۆم دەرکەوت کە نوێژ ژیانە، ژیانیش بە هەموو دووردرێژیی و وردەکارییەکانیەوە جۆرێکە بەڵکو چەند جۆرێکی جیاواز و ڕەنگاوڕەنگی نوێژە.

کاتێك لەخەو هەڵدەستیت بۆت دەردەکەوێت هەر زیندوویت و نەمردوویت لە دوای مردنی کەمی خەوتن کە لە ناویدا بوویت، هەست بە چاکەی ئەو کەسە دەکەیت بەسەرتەوە کە لەدوای ئەو مردنە جارێکی تر زیندووی کردیتەوە ئەوە تۆ نوێژ دەکەیت.

کاتێك سەیری دەموچاوی منداڵەکانت دەکەیت یان منداڵی خەڵکانی تر، سەرت دەسوڕمێت لە نهێنی گەشەیان و عەجاییی گەشەی دروستکردن و هەڵسوکەوت و ڕەوشتیان، هەر ڕۆژەو شێوەیەکی نوێ وەردەگرن، لێهاتویی تازە زیاد دەکەن، وشەو دەربڕینی تازە فێردەبن، کەواتە تۆ لە نوێژدایت .

کاتێك کەسوکارت هاندەدەیت لەسەر خێر، بانگیان دەکەیت بۆلای پەروەردگار بەکارزانیی و ئامۆژگاری باش، جا بەقسەت بکەن یان نا، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك کە لە هاوڕێیەکت یان برایەکت یان دراوسێیەکت خۆشدەبیت بەڕاستگۆیی و لە ناخی دڵتەوە لەسەر تاوانێك کە بەرامبەر تۆ ئەنجامیداوە، پاشان تۆ داوای لێبوردنی لێ دەکەیت وەك ئەوەی تۆ تاوانەکەت ئەنجام دابێت، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك کە جوێنێکت پێدەدرێت و بە گوێیەکانی خۆت گوێت لێدەبێت و تۆش وەڵام نادەیتەوە لەبەر خودا، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك دانیشتنێك بەجێ دێڵیت کە گۆشتی براکەتی تێدا دەخورێت بەمردوویی، ناشتوانی پارێزگاری لێ بکەیت یان ڕێڕەوی قسەکەن بگۆڕیت، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك دوعا بۆ نا مسوڵمانێك دەکەیت کە خودا هیدایەتی بدات بۆ ڕێگەی ڕاست، لەبری دژایەتیکردنی و شانبەشانی لەگەڵی و ڕقداگردن لێی، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك ڕەحمەت و سۆزی ئیسلام نیشانی ناو مسوڵمان دەدەیت و لێبوردەیی و نەرمیی و خۆشەویستی و شارستانی و ڕەوشت بەرزیی و ڕوخۆشیی ئیسلام پیشان دەدەیت، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك پارێزگاریی لە سیستەمی ئەو وڵاتە دەکەیت کە تۆ تیایدا دەژیت، تەنانەت ئەگەر وڵاتەکە نامسوڵمانیش بێت، بەچاکی پاداشتی چاکەکانیان دەدەیتەوە، وەفا دەکەیت بەو بەڵێننامانەی کە پێتداون لە ڕوی دارایی و باج و رەوشتیەوە، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك لە هەموو لایەکەوە هەست بە خراپە و تاوان دەکەیت و بەدڵ پێتناخۆشە و ناتوانی نە بەدەست نە بەزمان لایبەریت، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك ڕادۆزی (اجتهاد) دەکەیت بۆ ڕازیکردنی کەسوکارت و ڕازیکردنی چواردەورت، لە ڕادۆزیەکەتدا پێکابت یان نا، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك دڵنیا دەبیت لەوەی هەموو کارەکانت لەگەڵ خودا چاك و خێرداره و لە گومانی چاکە بەولاوە بەخودای خۆتی نابەیت چەندە شەیتان خوتخوتەی دڵت بدات بەشتی تر، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك سوپاسی خوا دەکەیت لەسەر ئەوەی پێیداویت و لەسەر ئەو شتانەی کە تاقیکردویتەوە پێی، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك چاوەکانت دەگریت لەگەڵ ئەوەی کە چواردەورت گیراوە بەهەموو هەڵخەلێندراوەکانی، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك کە ئارامدەگریت لەسەر نارەحەتیەکانی نەخۆشی یان فەقیری یان بەلاّ و موسیبەت یان بەرتەسکبوونەوە و ناڕەحەتیەکانی ژیان، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك خوێنێك دابین دەکەیت بۆ نەخۆشێك کە دەتوانی نەیدەیتیّ، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك بەشداریی خەم و خەفەت و ئازارەکانی مسوڵمانان دەبیت لە وڵاتێك کە وڵاتی خۆت نییە ئەگەر تەنها بەدەنگ و هەست و سۆزەکانت یان بە دوعاکانیشت بێت، ئەوە تۆ لە نوێژدایت.

کاتێك سەردانی نەخۆشێك دەکەیت، ئەوە تۆ لە نوێژدایت، باشە ئەی پێغەمبەرەکەت ئامۆژگاری نەکردویت کە دەستنوێژ بگریت بۆ هاوشێوەی ئەم جۆرە نوێژە ؟

کاتێـك تەسـلیم بەخـەو دەبیـت و لاشـەت ئیسـراحەتدەکات لـە هـەوڵ و ماندوبوونەکانی ڕۆژێکی درێـژ بـۆ خۆئامـادەکردن بـۆ ڕۆژێکـی تـازە لـە کـارکردن و

ئاوەدانکردنـەوە، ئـەوە تـۆ لـە نوێـژدایت، باشـە ئـەی پێغەمبەرەکـەت ئامۆژگـاری نەکردویت کە دەستنوێژ بگریت بۆ هاوشێوەی ئەم جۆرە نوێژە؟

لە کۆتایدا کاتێك لێپێچینەوە لە خۆت دەکەیت پێش خـەڵکی سـەبارەت بـەوەی بۆ خۆتت دەستەبەر کردوە لە ڕۆژدا و ئەوی بۆتە بارگرانی بەسەرتەوە، ئەوە تۆ لە نوێژدایت. ژیانت هەمووی نوێژە ئەگەر بەچاوی نوێژ لێی بڕوانیت و کارلێـك بکـەیت لەگەڵ وردەکاریەکاندا وەك نوێژکەر کارلێك دەکات لەگەڵ وشـەکان. هەوڵبـدە هـیچ کام لەو نوێژانەت کە لە بەردەستدان و لە هەر سوچ و قوژبنێکـدان لەکیسـت نەچـن چونکە هەریەك لـە وردەکاریـەکانی ژیـان تـەنها چـەند وشـەیەکن کـە گوزارشـت لـە گــەورەیی خــودای خولقێنــەر دەکــەن و پــاك و بێگــەردیی بــە دەســەڵاتیەوە نمایشــدەکەن، سوپاســی چــاکە و نیعمەتــەکانی وێنادەکــەن، بەیادهێنــەرەوەی بەندەکانیەتی بەوەی کە بەبەردەوامی ڕووبکەنە ئەو و بیریان دەخاتەوە کـە ئـەوان لەنوێژی بەردەوامدان ئەگەرچی دەستنوێژیشیان بۆ ئەم جۆرە نوێژانە هەڵنەگرتوە.

هـەرگیز توڕەمەبـە کاتێـك مرۆڤێـك خراپـەی لەگـەڵ کردیـت، بـەڵکوو بیکـە بـە تەسبیحات و نوێژ لەو کاتە کەتۆ لەدڵتدا: (سبحان الله) دەکـەیت، باشـە مـن و ئـەو مرۆڤە هەردوکمان دروسـتکراوی خـوداین؟ چ خامەیـەکی گەورەیـە کـە توانیویـەتی کەسایەتی جیاوازانە بەو هەموو بلیۆن مرۆڤە ببەخشێت؟

هەرشـتێك کـە توشـتدەبێت یـان گوێـت لێـدەبێت لـە چـواردەورت بیکـە بـە تەسبیحاتی خودا ئەگەر تێشنەگەیت چۆن دیمەنێك یان دروستکراوێك یان ڕەوشتێك بەناشــرین لەقەڵــەم بــدەم کــە دروســتکراوی خــودای گەورەیــە، تەنانــەت هەورەبریسـکەش کـە بـەخێرای چـاوم دەبـات و دەنگـی هەورەبریسـکە کـە نـاخم دەهــەژێنێت و هــەموو ئــەو شــتانەی کــە سروشــت لــەپڕ دەیهێنێتــە کایــەوە لــە توندوتیـژیی و ترسـاندن و هەڵچـوونەکانیەوە، ئەمانـە لـە دەروونمـدا تـەنها دەبنـە تەسبیحاتی تر کە زیاتر نزیکم دەکاتەوە لە خودا.

له هەموو جووڵە و وەستان و ڕاوەستان و دانیشتن و خواردن و خواردنەوە و کاسبیکردن و پارە سەرفکردن و گوێگرتن و سەیرکردن و قسەکردن و گومان و بیرکردنەوەکانت، ببە بە بەشێك لەم گەردوونە زییکرکەر و سوپاسگوزار و خواپەرستە بێوچانە و نوێژکەرە بێ ڕاوەستانە، کەواتە تۆ لە نوێژدایت چەندە لەژیاندا بیت، بۆیە ئەم بناغە زێڕینانە بکە بە دەستورت لە ژیاندا:

– هیچ هەنگاوێك مەنێ لە دەرەوەی ماڵەوەتدا بەمەبستی چاککردنی دنیات تا هەنگاوێك نەنێیت لەگەڵیدا لەناو دەروونتدا بەمەبەستی چاککردنی دواڕۆژت.

– هیچ ئەندامێکی لاشەت مەشۆ لە دەستنوێژگرتن لە پیسی بەشی سەرەوە تا لەگەڵیدا هەندێك لە پیسیەکانی ناوەوەت نەشۆردبێت

– هیچ وشەیەك مەڵێرەوە لە نوێژەکانتدا تا عەزم نەکەیت کە لە دوایدا کردارەکانت پشتڕاستی نەکاتەوە.

– سەرت دامەنەوێنە لە نوێژدا تا دەروونت دانەنەوێنیت وەك ملکەچی ژیانتدا.

– لەمزگەوت دەرمەچۆ بەشێوەی ئەو مرۆڤەی پێش نوێژەکەت چویتە ناوییەوە کەمێك پێش ئێستا.

– خواحافیزی لە مانگی ڕەمەزان مەکە تا خواحافیزی لە تاوانێك نەکەیت لە ژیانتدا و خواپەرستی و تاعەتێك زیاد نەکەیت.

– هیچ چاکەیەك بەدەستە ڕاستت مەبەخشە تا خراپەیەکی بەدەستە چەپت لێ دوورنە خەیتەوە.

– هیچ قوربانیەك کەنزیکت دەکاتەوە لە بەهەشت ئەنجام مەدە تا لەگەڵیدا گوناهێك سەر نەبڕیت کە نزیکت دەکاتەوە لە دۆزەخ.

– هیچ قڕوشێکی زیادە مەکە بەخێر تا بیری خۆت نەهێنیتەوە کە یەکێك لەتاو بەدواگەڕانیدا مردووە بۆ ئەوەی نەجاتی بدات لە سەرمایەك یان نەخۆشییەك یان برسێتیەك.

– هیچ پەرداخێك لێواولێو پڕمەكە كە بزانیت تەنها نیوەیت پێ دەخورێتەوە.

– قەترەیەك ئاو بەفیڕۆمەدە تا بیرت نەیەتەوە كە خەڵكانێك هەن كە تینویانە ڕۆژانە دەخنكێن بۆی.

– هیچ پاروە خواردنێك مەخە دەمتەوە تا بیری خۆتی نەهێنیتەوە كە خەڵكانێك مردون لە بەر بێبەشبوون لێی.

– هیچ پاشماوەی سفرەی نانخواردنێك فڕێمەدە تا دڵنیا نەبیت كە خودای گەورە دەتوانێت بێبەشت بكات لە تەواوی ئەو خواردنانەی لەسەر سفرەكەن.

– نیگەران و توڕەمەبە بۆ ئەوەی كە پێڵاوێكی شایستەت نیە، چونكە خەڵكانیك هەن هەردوو قاچەكانی نین تا پێڵاوی لەپێ بكات.

– نیگەران مەبە كاتێك پێداویستیەكی ماڵەكەت لەكاردەكەوێت یان پارچەیەكی لە ئەساسی ماڵەكەت دەشكێت، چونكە خەڵكانێك هەن خانوشیان نییە.

– هیچ خوێیەك لە خواردنەكت مەكە تا لەگەڵیدا شیرینیەك نەدەی بە وشەكانت.

– بەخراپی باسی هیچ كەس مەكە تا دڵنیا نەبی كە خەڵكانێكی تر هەن ئاوا بەخراپی باسی تۆش دەكەن.

– هیچ وشەیەكی ناشرین بۆ یەكێك لە دایك و باوكت بەكارمەهێنە چونكە دڵنیابە كە گوێت لە هاوشێوەكەی دەبێت لە داهاتوودا لە منداڵەكەت.

– ئەوانەی خوارخۆت بەكەم و سوك سەیرمەكە تا دڵنیانەبیت كە خوای گەورە دەتوانێت لەو كەمتر و سوكترت بكات لەلای ئەو و خەڵكانی تر.

– داوای لێبوردن لە خودا مەكە تا دەستپێشخەری نەكەیت بە بوردنی ئەوكەسانەی كە خراپەیان كردووە بەرامبەرت.

– ڕێگەمەدە بە چونەژوورەوەی رق و كینە با كەمیش بێت كە لە پەنجەرەی دڵتەوە بێت ژوورەوە تا ڕێگەی چوونەژورەوەی زۆرێك لە خۆشەویستی والآنەكەی كە بچێتە ژورەوە لە پەنجەرەیەكی ترەوە.

– مەپاڕێوە بۆ ئەو کەسانەی کە خۆشت دەوێن تا لە پێشدا دوعا بۆ ئەو کەسانە نەکەیت کە گومانت هەیە کە خۆشتدەوێت یان گومانت هەیە لەوەی کە تۆیان خۆشدەوێت .

– ئارامگرتنی دوورودرێژ بەقورس مەزانە تا چێژ نەبینیت بەدڵنیاییت لە وەرگرتنی پاداشتی گەورە و ڕزگاربوونی نزیك، لەکۆتایدا لەبیرتنەچێت کار بکەیت بە وەسیەتی پێغەمبەرە بەخشندەکەت (دروودی خودای لەسەر):

((اعبد الله كأنك تراه واعدد نفسك فى الموتى، واذكر الله عند كل حجر وعند كل شجر، وإذا عملت سيئة فاعمل بجنبها حسنة، السر بالسر والعلانية بالعلانية)) {*حسنة الألباني في صحيح الترغيب، عن معاذ بن جبل*} .

لەدوا ئەمانە، لەبیرت بێت لەگەڵ هەموو نەفەسێکی ژیانت کە ژیانت هەمووی نوێژە لەهەموو حاڵەت و گۆڕانکارییەکانی ژیانتدا دەروونت پاك بێت، وەك پاکیی جەستەی ئەو کەسەی دەچێت بۆ نوێژکردن، پاڵفتەی ڕۆح وەك پاڵفتەی ئەو خوێنەی کە خودا لە دەمارەکانتدا هاتوچۆی پێدەکات سوپاسگوزاری خودای خۆت بە وەك سوپاسی هەر خانەیەك لە خانەکانت و سوپاسی هەر جومگە و ڕەگێك و سوپاسی هەر جوانییەك لە جوانییەکانی لاشەت، بزانە بەڕێوەبردنی باشی نوێژەکانت بەڕێوەبردنی ژیانتە بەچاکی. ئیسلام ڕوکنی یەکەمی پێداویت تا دواڕۆژی خۆتی پێ زامن بکەیت، ڕوکنی دووەمیشی پێداویت تا دونیا و دواڕۆژتی پێ زامن بکەیت.

بشزانە کە من لەو شتانەی کە لەم کتێبەدان بەتەنها مەبەستم بووە کە ببنە کلیلی بچوك کە بەدەستەوە بیانگریت بۆ کردنەوەی خەزێنەکانی هزر و بیرت پێیان بفڕیت لە جیهانەکانی خەیاڵت لەگەڵ خودادا و بچیتە قوڵایی بەحرە دۆزراوەکان لەگەڵ بوونەوەرەکانی خودادا، بەشێوەیەك بۆ هەر یەکەیان کتێبێکی تایبەتت ببێت بۆ چاك بەڕێوەبردنی نوێژەکانت و چاك بەڕێوەبردنی ژیانت.